# کۆمەڵێک پرسیار و وەڵامی گرنگ لەسەر بیروباوەڕی ئیسلامی




نوسین و ئامادەکردنی :

ڕەنج شێخانی




# کۆمەڵێك پرسیارو وەڵامی گرنگ
# لەسەر بیروباوەڕی ئیسلامی

# ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوک: " کۆمەڵێك پرسیارو وەڵامی گرنگ لەسەر بیروباوەڕی ئیسلامی "

نوسین و ئامادەکردنی: " ڕەنج شێخانی "

دیزانینی ناوەوە: " عبدالله خاکی "

دیزاینی بەرگ: " محمد عبدالرحمن "

# پێشکەشە

* بەو گەنج و لاوانەی کە لە هەوڵی فێربونی زانستی شەرعی و بیروباوەڕەکەیان دان.
* بەو  کەسانەی کە تائێستاش لەڕوکەش دا مسوڵمانن و هیچ شارەزایی یەکیان نییە لە بیروباوەڕەکەیان.
* بەهەموو ئەو خوێنەرە بەڕێزانەی کە بەگرنگییەوە لەبابەتەکانم دەڕوانن.
* بەهەموو خوشك و برایەکی دڵسۆزی ئیمانیم کەبیروباوەڕەکەمان پێکەوە کۆی کردوینەتەوە.

**ڕەنجدەر کوردی**

# پێشەکی

پاش سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ خوای گەورەو بێ هاوتا کە ئەم دەرفەتە ی بۆ ڕەخساندم تابتوانم ئەم جارەشیان بەکۆمەڵێك چەپکە گوڵی بۆن خۆشی ئیسلامەکەمەوە بێمەوە خزمەتی خوێنەرانی بەڕێز، وەك ئەهلی نقڵ ئەوەندە ی کە تێگەشتوم لە بەرنامە ڕاست و دروستەکەی ئیسلامی پیرۆز کەمێك خزمەت بە ئیسلامە پیرۆزەکەم بکەم، دیارە لەم پەرتووکەدا کۆمەڵێك پرسیاری گرنگمان ورووژاندووە لەسەر ئیسلام و ئیمان و شەش پایەکانی و پاشان ئەو شتانەی لە ئیسلام و ئیمان دەمان باتە دەرەوەو باسی هەندێك لەو کۆمەڵ و تاقمانەی لەڕێڕەوی ڕاستەقینەی ئیسلام لایان داوە بەکورتی، تاوەکو بەلانی کەم ڕێگایەك بکەینەوە بۆ گەنجەکانمان وەك پەیژەیەك لەم پەرتوکەوە سەرکەون بۆ پلە بەرزەکانی بیرو باوەڕی ڕەسەنی ئیسلامی و خۆیان شارەزابکەن لەو بیرو باوەڕەی کەلەسەردەمی ئادەم (علیه السلام) تا خاتەمی سەروەرمان (محمد) ﴿ﷺ﴾ کەخەڵکیان بۆ بانگ هێشت کردوە تا لەبەندایە تی کردنی بەندەوە ڕزگاریان بکەن بۆ بەندایەتی کردنی (الله) ی تاك و تەنها، ئە وەی کە هاندەرم بوو بۆ ئەم کۆمەڵە پرسیارە؟ کەم شارەزایی نەوەی نوێی مسوڵمانە لە بواری بیروباوەڕەکەیدا! کە بەداخەوە زۆر جار دەبینین تاکی مسوڵمان لەپڕ ناوبانگ دەردەکات و دەبێتە خۆشەویستی نێو مسوڵمانان کە چی کاتێك دەزانین هەر زوو دەگلێ و لەناو دەچێت! دەزانن هۆکارەکەشی چییە؟ چونکە بیروباوەڕەکەی بە تەواوی وەرنەگرتووەو دانەمەزراوە،

بەڵکو بەهەندێك بواری تری ئیسلامەکەوە خۆی خەریك دەکات و لەلای گرنگتر دەبێت!، بێ ئاگا لەوەی کە(عەقیدە) سەرەتاو بنچینەی دامەزراندنی تاکی مسوڵمانە کە لەناخی مرۆڤەوە چەکەرە دەکات و پاشان دەگاتە زمان و بەزوبانی دەری دەبڕێت و لەوێشەوە هەر زوو بەلاشەدا بڵاو دەبێتەوەو ئەرکی لاشەش ئەنجام دانی کاروکردەوەیە بەپێی داخوازی ئەو ئیمانەی کە لە دڵی یەوە سەرچاوەی گرتوەو، بەوشێوەیە عەقیدەیەکی پۆڵاین و تۆکمەو بەهێز بۆ خاوەنە کەی دروست دەبێت. بەڵام ئەگەر ئێمەی بانگخواز لەپێش خەڵکیدا، خۆمان شارەزای بیروباوەڕە کەمان نەبین ئەو کات چۆن خەڵکی بانگ بکەین بۆ یەك خواپەرستی؟، یان جاری وا هەیە پرسیاری شەرعی دەکرێت لەهەندێك مامۆستاو بانگخواز، لە وەڵامی پرسیارەکەدا کەنایزانێت! دەڵێت: ببورە من کەسێکی پەروەردەییم یان لە فکرو سیاسەت دا زیاتر شارەزام یان لە تەزکیەی نەفس دا یان لەفیقهـ یان ...هتد. ئەگەر پرسیاری عەقیدەیی لێ بکەیت دەمی دێت بەیەك دا بۆ وەڵام دانەوەی! کە بەڕاستی ئەمە کەم تەرخەمی و تێنەگە شتنە لەئەسڵی ئیسلامە کە، چونکە ناکرێت تۆ شوێن کەوتەی دینێك بیت، بەڵام شارەزایت نەبێت لە بیروباوەڕەکەی خۆت دا! ئەگەر چی لەبەرامبەریش دا کۆمەڵێك مامۆستاو بانگخوازیش تەنها خەریك بن بەلایەنی(عەقیدە)وەو واز لە بوارە کانی تری ئەو دینە بهێنن ئەوەش دیسان هەر هەڵەیە چونکە خاوەنەکەی توشی هەڵەو گۆشەگیری دەکات کە ناتوانێت بیرو باوەڕەکەی وەك پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بگەیەنێت بەخەڵکی!،

کەوایە دەبێت مرۆڤی باوەڕدار لەدوای فێربوونی بیروباوەڕەکەی لایەنەکانی تری ئەودینە پشت گوێ نەخات چوونکە ئەوانیش بەشێکن لەبیرو باوەڕەکەی! ، هەر بۆیە بەپێویستم زانی کە ئەم بابەتە گرنگە عەقیدەییە لەشێوەی پرسیارو وەڵام بخەمە پێش چاوی خوێنەرانی بەڕێزی کورد زوبان بەڵکو ببێتە سەرەتا یەك بۆ شارەزابوون لە بیروباوەڕی ڕەسەنی ئیسلامی. داواکارم لەخوای گەورە بیکاتە توێشوی دوارۆژمان و وە ببێتە توێشویەکی نەبڕاوە بۆڕۆشن کردنەوەی ڕێگا تاریکەکانی دونیاو دوارۆژیشمان، خوای گەورە ئێمەش و ئێوەش بکاتە پێویستی بۆ خزمەتی دینەکەی و فێرمان بکات و تێرمان بکات لەبیروباوەڕی ئیسلامی ڕەسەن و لەگەڵیشیدا، دامەزراوی بەردەوامیمان پێ ببەخشێت لەسەر دینداری و لەپاش ئەم نوسینەش زیاتر سنگمان فراوانتر بکات بۆ نوسینی بابەتی باشترو بەسود (اللهم آمین)

هەر هەڵەیەك لەوەڵامەکان دا ڕویاندابوو ئەوەهەڵەی خۆمەو ڕاستییەکانیش لە خوای گەورەوەیە خوا لێمان ببورێت لەسەر ئەنجامدانی هەڵەو کەمو کورتیەکان و لەدونیا پێش مردن دەرفەتی ڕاست کردنەوەیمان پێ ببەخشێت.

تێبینی: خوێنەری بەڕێز دڵنیا دەکەمەوە کەمن وەك ئەهلی نقڵ وەڵامەکانم نوسیوەو نقڵم کردوە وە لەدوای خوێندنەوەی چەندین پەرتوك و بابەتی گرنگی بیروباوەڕ ئەو فەرمایشتانەم نوسیوە کەلەلایەن زانایانی سەر ڕاستەوە کە لەکیتاب و سوننەوە وەرگیراون و، بەپشتیوانی خوای گەورە خۆم پاراستوە لە بیروبۆچونی نامۆو لاڕێ بە بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلام.

**ڕەنج شێخانی 1441 کوچی / 2020 زاینی**

## پرسیاری یەك

**پێناسەی ( ئیسلام و ئیمان ) لەڕووی شەرعی و زمانەوانییەوە چییە؟**

### وەڵامی پرسیاری یەك:

**پێناسەی ئیسلام لەهەردوو ڕووەکەیەوە:**

یەکەم: پێناسەی ئیسلام لەڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە: خۆ بە دەستەوە دان و تەسلیم بوونە بەخوای گەورە، بەجێ بەجێکردنی سەرپشکانەی فەرمانەکانی و بەتوخن نەکەوتنی بەرهەڵستییەکانی.

ئەمانەش لە وەحیدا دیاری کراون، هەرکەسێك دڵ و دەرونی لە هەموو کاروبارێك دا تەسلیمی خوا بکات، ئەوە بە مسوڵمان دەژمێردرێت، هەر بۆیە پێغەمبەران و نێردراوان لە هەموو کەس زیاتر خۆیان تەسلیمی خوا کردبوو، بۆیە بە یەکەمین مسوڵمان دەدرانە قەڵەم، بۆ نموونە لەسەر زمانی موسا (علیەسلام) خوای گەورە دەفەرمووێ: **(قَالَ سُبۡحَـٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَ أَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ)**[1] واتە: موسا فەرمووی: پاك و بێ گەردی بۆ تۆ، تۆبەم کردووە و پەشیمان بومەتەوە، من یەکەمینی باوەڕدارەکانم.

بەبێ ئەو خۆ تەسلیم کردنەش، کەدەبێ لە هەموو هەڵس و کەوتێکدا دەربکەوێت، کەس بەمسوڵمان ناژمێردرێت وەك خوای گەورە دەفەرمووێت:

**(فلا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا)**[2]

---

([1]) - (الاعراف/١٤٣)

([2])- (النساء/٦٥)

واتە: سوێند بەخواکەت، باوەڕیان دانامەزرێت و بە مسوڵمان حسێب نابن تاتۆ نەکەنە حاکم و داوەر لەو کێشەو ناکۆکییانەی لە نێوانیان دا ڕوودەدات، جاکەتۆ حوکمت کردن هیچ گرێ و گۆڵێك لەدڵ و دەرونیان دا نامێنێت و ئەوجا بە تەواوی خۆ تەسلیم دەکەن.

**دووەم:** پێناسەی ئیسلام لە ڕوی زارەوە شەرعییەکەیەوە بریتییە لە:

- **بنەما لایەنگرەکان:** بریتییە لە فەرمان بەچاکەو بەر هەڵستی و تێکۆشان و حوکم و سزا خواییەکان.
- **بیناکە:** بریتییە لە سیستم و بەرنامەکانی ژیان وەك (بەرنامەی سیاسی، بەرنامەی ئابوری، بەرنامەی فێرخوازی، بەرنامەی ڕەفتارو ڕەوشت، بەرنامەی کۆمەڵایەتی).
- **ڕوکنەکان:** بریتییە لە (شایەتوومان، نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج).

لەوانەیە کەسێك لێرەدا ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ بێنیتەوە پێی وابێت پێناسەی ئیسلام تەنیا بریتییە لەو پێنج پایەیە! کە لە ئیمامی عومەرەوە گێڕدراوەتەوە (ڕەزای خوای لێبێت) کەدەفەرمووێت:

**(عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، قَالَ : بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ذَاتَ يَوْمٍ ، إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ، شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعْرِ ، لَا يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ ، وَلَا يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ، حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ ﴿ﷺ﴾، فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ ، وَقَالَ يَا مُحَمَّدُ ، أَخْبِرْنِي عَنِ الْإِسْلَامِ ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾: " الْإِسْلَامُ : أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلًا " . قَالَ : صَدَقْتَ ، قَالَ : فَعَجِبْنَا لَهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ .....).**[1]

واتە: لە ئیمامی عومەرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: کەوا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا﴿ﷺ﴾دانیشتبووین، لەپڕ پیاوێك هات پۆشاکەکەی بەری زۆر سپی بوو، مووی سەری زۆر ڕەش بوو، هیچ ئاسەوارێکی سەفەری پێوەدیار نەبوو وەك (تۆز و خۆڵ و ماندوویێتی و تینوێتی) کەسیشمان نەمان دەناسی، چووە خزمەت پێغەمبەر﴿ﷺ﴾هەردوو ئەژنۆی نا بەهەردوو ئەژنۆی پێغەمبەرەوە﴿ﷺ﴾ هەردوولەپی خستەسەر هەردوو ڕانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئینجا پرسی ئەی محمد﴿ﷺ﴾ ئیسلامم بۆ باس کە: فەرمووی: ئیسلام ئەوەیە بڕیار بدەیت کەهیچ شتێك نییە شایەنی پەرستن

[1] - (متفق عليه)

بێت بەڕاستی بێجگە لە الله، وەبڕیار بدەیت کە محمد﴿ﷺ﴾ بەندەو نێردراوی خوایە، نوێژ بکەیت و، زەکات بدەیت و، ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت و، ئەگەر توانات هەبوو حەجی ماڵی خوا بکەیت، کابرا ووتی: ڕاستت کرد، پێمان سەیر بووا کە لێشی دەپرسێت و دەشڵێت ڕاستت کرد.......

لێرەدا دەبینین تەنیا باسی پێنج پایەکە کراوە!، کە زۆرێك لە مسوڵمانانی ئەمڕۆ بێ ئاگا لەهەندێك فەرموودەی تری پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ تەنیا بەپێنج پایەکە پێناسەی ئیسلام دەکەن! کەبەراستی ئەمە بۆچونێکی هەڵەیە چونکە ئەم پێنجە تەنیا ڕوکنن و هێشتا خانوی ئیسلامەکە دروست نەبووە، وەك ئەوەی بڵێین خانوویەك لەسەر پێنج پایە دامەزراوە بەڵام ئەگەر جوان دیقەت بدەین دەزانین کەهێشتا نەبۆتە بینای تەواو!، هەر بۆیە لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: **(الإسلامُ أنْ تَعْبُدَ اللهَ لا تُشْرِكُ بهِ شيئًا ، وتُقِيمَ الصَّلاةَ، وتُؤْتِيَ الزكاةَ ، وتَصُومَ رَمَضَانَ ، وتَحُجَّ البيتَ ، والأَمْرُ بالمعروفِ ، والنَّهْيُ عَنِ المنكرِ ، وتَسْلِيمُكَ على أهلِكَ ، فَمَنِ انْتَقَصَ شيئًا مِنْهُنَّ فهوَ سَهْمٌ مِنَ الإسلامِ يَدَعُهُ ، ومَنْ ترَكَهُنَّ كلَّهُنَّ فقد ولَّى الإسلامَ ظَهْرَهُ)**[1]واتە: ئیسلام ئەوەیە کە خوای گەورە بپەرستیت و هاوەڵی بۆ پەیدا نەکەیت، نوێژ بکەیت، فەرمان بکەیت بەچاکە، بەرهەڵستی بکەیت لەخراپە،

---

([1]) - الراوي : أبو هريرة | المحدث : الألباني | المصدر : صحيح الترغيب ، الصفحة أو الرقم: ٢٣٢٤ | خلاصة حكم المحدث : صحيح لغيره
التخريج : أخرجه ابن شاهين في ((الترغيب في فضائل الأعمال)) (٤٨٧)، والحاكم (٥٣)، والبيهقي في ((شعب الإيمان)) (٨٨٤٤)

سڵاو بکەیت لەماڵ و منداڵی خۆت، هەر کەسێك شتێکی لەمانە کەم کردەوە ئەوە وازی لەبەشێکی ئیسلامەکەهێناوە، هەرکەسیش وازی لەهەمووی هێنا، ئەوە پشتی لە ئیسلامەکە کردوە.

کەواتە ئیسلامیش لەسەر ئەو پێنج پایەیە دامەزراوە و بۆ تەواوکردنی ئیسلامەکە پێویستیمان بەبنەما لایەنگرەکان و بینای ئیسلامەکە دەبێت ئەوسا دەتوانین بڵێین پێناسەی شەرعی ئیسلامەکەمان کردووە.

**پێناسەی ئیمان لەهەردوو ڕووەکەیەوە:**

یەکەم: پێناسەی ئیمان لە ڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە بەڕاست زانین، وە زانایان دەفەرموون: **(تصديق بالقلب، و إقرار باللسان، وعمل بالجوارح)** واتە: بەڕاست زانین و چەسپاندنی لەنێو دڵ دا وە دەربڕینی بەزمان وە ئەنجام دانی بەلاشە.

نابێت بەتەنیا مرۆڤ باوەڕ بەدڵ بێنێت و تەواو! چونکە باوەڕ تەنها تێڕوانینێکی بێ بەرهەم و ڕاو سەرنجێکی ساردو سڕ نییە دەربارەی ڕاستی یەکان، چونکە زۆر کەس پەی بەڕاستی یەکان بردوەو دڵنیابووە کەڕاستن، بەڵام نکوڵی لێ کردون و ستەم کاری و خۆ بەزل زانی بەرچاویان تاریك کردوە، خوای گەورە دەربارەی فیرعەون و شوێن کەوتوانی دەفەرمووێت: **( وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ)**[1]

واتە: نکوڵیان لە ئایەتەکان کردوو باوەڕیان پێ نەهێنان و لە ناخیشەوە دڵنیا بوون کە ڕاستن، بەهۆی ستەم کاری و لوت بەرزییەوە باوەڕیان پێ نەهێنا.

[1] - (النمل/١٤)

وە باوەڕ چەند ووشەیەك نییە تەنیا بەزمان بوترێت، چونکە مرۆڤی دووڕوو هەمیشە بانگەشەی بڕواداری خوا دەکات، بەڵام خوای گەورە دەفەرمووێت: **(وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأَخِرِوَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ)**[1]
واتە: لەخەڵکی دا کەسانێك هەن دەڵێن: باوەڕمان هێناوەبەخواو بەڕۆژی دوایی وباوەڕ داریش نین.

هەروەها باوەڕ بەچەند کردەوەو دروشمێك نی یەئەنجام بدرێت و بەس، چونکەهەموو کەسێکی فێڵباز بۆ ڕووپامایی دەتوانێت هەمان کردەوە ئەنجام بدات کەباوەڕ دارێکی ڕاستەقینەئەنجامی دەدات،وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: **(إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلاً)**[2]
واتە: بەڕاستی دووڕووەکان (وا دەزانن) فێڵ لە خوای گەورە دەکەن (لەکاتێکدا) ئەو زاتە فێڵەکانیان پووچ دەکاتەوە (نازانن کە دیار و نادیار، لای خوا ڕوون و ئاشکرایە)، هەر کاتێکیش (بۆ ڕیاو ڕووپامایی) هەڵدەستن بۆ نوێژ، زۆر بەلەش گرانیی و تەمەڵیی هەڵدەستن، ئەوانە ڕیایی و ڕوپامایی بۆ خەڵکی دەکەن، زۆر کەم یادی خوای گەورە دەکەن.

کەواتە لێرەوە بۆمان ڕوون بۆیەوە کەباوەڕ: ئەو هەست و نەستە بەرزو پیرۆزەیە کە لەناخی مرۆڤ دا جێگیر دەبێت و تێکڕایی دەروونی دادەگرێت و هەمیشە بەزمانی دەری دەبڕێت و تین و تەوژم دەدات بە هەموو ئەندامەکانی

---

[1] - (البقرة/٨)
[2] - (النساء/١٤٢)

و وا لەمرۆڤ دەكات كە هەر سەرمایەیەكی بەنرخی هەیە لە: گیان و ماڵ و سامان و كەس و كاری لە پێناوی دا بەختیان بكات، چونكە بەلایەوە لە هەموویان بەنرخترە!، هەر بۆیە كاتێك مرۆڤ باوەڕەكەی دادەمەزرێت كەهەر سێ بەشەكەی لەخۆیدا جێ بەجێ بكات.

**دووەم:** پێناسەی ئیمان لەڕووی زاراوەی شەرعییەوە: تەواو كەری فەرموودە كەی پێشو كەئیمامی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) دەیگێڕێتەوە لەدوای پرسیاركردن سەبارەت بەئیسلام ئەوجا فەرمووی: **(.....قَالَ : فَأَخْبِرْنِي عَنِ الْإِيمَانِ . قَالَ " : أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ " . قَالَ : صَدَقْتَ ......)**[1]

واتە: ئینجا ووتی: ئەی باوەڕهێنان چۆنە؟ فەرمووی: ئەوەیە كە باوەڕ بەخواو، بەفریشتەكانی و، بەكتێبەكانی و، بەنێرراوەكانی و، بەڕۆژی دوایی و، هەروەها بەخێرو شەڕی قەدەر بهێنیت، كابرا ووتییەوە ڕاستت كرد!.

كەوابو دەبێت مرۆڤی باوەڕدار بە دڵ وزمان و كردەوە باوەڕ بهێنێت بەم شەش پایەیەی كەلەفەرمودەكەدا باس كراوە ئەو كات دەتوانین بڵێین باوەڕی دامەزراووە لەڕیزی باوەڕداران دا هەژمار دەكرێت.

---

(1) - (متفق عليه)

زیادەی فەرمودەکە:
لە دوای ئەمە پرسیاری چاکەو قیامەتی کرد لەپێغەمبەری خوا ئەویش وەڵامی دایەوەو پاشان هەڵساو ڕۆشت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ڕوی کردەئیمامی عومەرو فەرمووی: **(ثُمَّ قَالَ لِي : " يَا عُمَرُ ، أَتَدْرِي مَنِ السَّائِلُ ؟ . قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ . قَالَ: هَذَا جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ)**[1]
واتە: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی عومەر دەزانی ئەوە کێ بوو دەیپرسی؟ ووتم: خوا پاشان پێغەمبەری خوا دەزانن، فەرمووی ئەوە جوبرەئیل بوو هاتبوو ئاینەکەتان فێر کات.
هەر بۆیە هەندێك کەس لەڕستەی (هاتبو ئاینەکەتان فێربکات)واتێ دەگەن، کە ئاینی ئیسلام هەموی ئەو سێ باسەیە! بێ گومان ئەمە هەڵە تێگەشتنە، چونکە ڕێسای ئاسایی تێگەشتن ئەوەیە، کەهەمو نەزانراوێك لە ڕستەی نەرێدا دەبێتەوە بەباسێکی گشتی، کەوابو فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەوەی کە(ئاینەکەتان فێر کات) مانای ئەوەنییە، کەکۆو بەشەکانی هەمو ئاینەکاتان فێردەکات! بەڵکو هەندێك لە ئاینەکەتانتان فێر دەکات.
**تێبینی:** خاڵێکی زۆر گرنگ هەیەکەلێرەدا بەکورتی دەمەوێت ئاماژەی پێ بدەم، ئەویش ئەوەیە جیاوازیەك هەیە لەنێوان ئیسلام و ئیمان دا ئەویش ئەوەیە باسەکانی ئیسلام هەموویان دیارو ئاشکران بەڵام باسەکانی باوەڕ هەموویان نادیارو شاراوەن.

---
(1) - (متفق عليه)

## پرسیاری دوو

**بۆچی خوای گەورە ئێمەی دروست کردووەو حیکمەتی بەدی هێنانی بونەوەر چییە؟**

### وەڵامی پرسیاری دوو:

خوا ئێمەی دروست کردووە بۆ ئەوەی کە بەتەنها بیپەرستین و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین، بەڵگەش بۆ ئەمە: خوای گەورە فەرموویەتی:**(وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)**[1]

واتە: ئێمەجنۆکەو مرۆڤمان دروست نەکردووەئیللا بۆ ئەوەنەبێت کەبەتەنها من بپەرستن.

هەروەها فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ **(حَقُّ اللهِ على العباد أنْ يعبدوه ولا يُشركوا به شيئاً)**[2] واتە : ماف و حەقی خوا لەسەر بەندەکانی بریتیە لەوەی کە بیپەرستن و هیچ هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن.

وە سەبارەت بەحیکمەتی بەدی هێنانی بونەوەریش بێگومان خوای گەورە ئەم بونەوەری بەخۆڕایی وبەبێ حیکمەت بەدی نەهێناوە. هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: **(أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَ أَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ، فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ)**[3] واتە: ئایە وا گومانتان برد کەوا ئێوەمان هەروەها بە خۆڕایی وبەبێ مەبەست بەدیهێناوە،

---

[1] - (الذاريات/ ٥٦)

[2] - [متفق عليه / صحيح البخاري رقم : (٢٨٥٦) وصحيح مسلم رقم : (٣٠)

[3] - (المؤمنون/١١٥ – ١١٦ )

وە ئێوە ئیتر بۆلای ئێمە ناگەڕێنەوە، تا پاداشتی کردەوەکانتان بدەینەوە . پاك و بێگەردی وپیرۆزی بۆ خوای گەورە لەوەی کەوا شتێك بەدیبهێنێت بەبێ مەبەست ..

هەروەها دەفەرمێ: **(أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى)**[1]

واتە: ئایە ئادەمیزاد وا دەزانێت هەروا وازی لێدهێنرێت بە خۆڕایی، بەبێ ئەوەی هیچ فەرمان و قەدەغەیەکی بە سەردا بدەین ؟!

(1) - ( القيامة/ ٣٦)

## پرسیاری سێ

**خوای گەورە چۆن ئادەمیزادی لەو مەبەستە ئاگادار کردۆتەوە کە ئەوانی بۆ بەندایەتی کردنی خۆی بەدیهێناوە؟**

### وەڵامی پرسیاری سێ: (بەچەند رێگایەك)

**یەکەم:** پاش بەدیهێنانی ئادەم خوای گەورە هەر ئەو کاتە لە پشتی ئادەم بەڵێنی لە نەوەکەی وەرگرت کەوا هەر ئەو پەروەردگاریانە و دەبێت بە تەنها بەندایەتی وپەرستن بۆ ئەو بکەن، چونکە هەر ئەو شایەنی پەرستن و بەندایەتی کردنە .. خوای گەورە دەفەرمووێت :(وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ، أَوْ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ، وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ)[1]

واتە: وە ئەو کاتەشیان یاد بخەرەوە کاتێك کە پەروەردگارت لە جیهانی پەنهانی و شاراوەدا پشتا و پشتی نەوەی ئادەمی کۆ کردەوە و پەیمانی لێ وەرگرتن و کردنیە شایەت بە سەر خۆیانەوە وپێی فەرمون: ئایە من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش هەمو وتیان: بەڵێ شایەتیمان داوە ، ئەمەیش بۆ ئەوەی نەوەکو لە رۆژی قیامەتدا بڵێن: بەڕاستی ئێمە لەمە بێئاگا بوین!! یاخود نەوەك بڵێن: جا ئێمە چی بکەین، بەڕاستی باو وباپیرانمان لە پێشدا هاوبەشیان بۆ خوای گەورە بڕیار دابو وئێمەش نەوەیەك بوین دوای ئەوان هاتین وشوێنی ئەوان

(1) - (الأعراف/ ١٧٢ – ١٧٤).

کەوتین وهیچ بەڵگەیەکی ترمان پێ نەبو، ئایە ئێمە سزا دەدەیت بەهۆی کردەوەی خراپە کارانەوە ؟ ئا بەو شێوەیە ئایەت وفەرمانەکان روندەکەینەوە، تا لێی ورد بنەوە وبگەڕێنەوە.

هەروەها لەفەرمودەکەی ئەنەسی کوڕی مالیك دا (خوای لێ رازی بێت) دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: **(يَقُولُ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لِأَهْوَنِ أَهْلِ النَّارِ عَذَاباً: لَوْ كَانَتْ لَكَ الدُّنْيَا وَمَافِيْهَا أَكُنْتَ مُفْتَدِياً بِهَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ ، فَيَقُولُ: قَدْ أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ هَذَا وَ أَنْتَ فِي صُلْبِ آدَمَ: أَنْ لاَ تُشْرِكَ(أَحْسَبُهُ قَالَ) وَلاَ أُدْخِلَكَ النَّارَ، فَأَبَيْتَ إِلاَّ الشِّرْكَ )**[1]

واتە: خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا بە کەسێك کە سوکترین سزا دەدرێت دەفەرموێت: ئایە ئەگەر هەرچی لەسەر زەویدایە موڵکی تۆ بوایە دەتدا بۆ ئەوەی لەم سزایە رزگارت بوایە ؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، جا ئەویش پێی دەفەرمێ: من زۆر لەوە کەمترم لێ داوا کردی، کاتێك کە لە پشتی ئادەمدا بویت:

کەوا هیچ هاوبەشێکم بۆ بریار مەدە، منیش ناتخەمە دۆزەخەوە، بەڵام تۆ هەر رازی نەبویت و هاوبەشت بۆ بڕیاردام.

**دووەم:** کە لە دایك دەبن هەر لەسەر ئەو فیترەتە پاکە لە دایك دەبن، تا دایك وباوك وکۆمەڵگا دەیانگۆڕن .. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: **(فَأَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗاۚ فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ)**[2] واتە: ئەی ئادەمیزاد تۆ بە دڵێکی پاك وبێگەردەوە رو بکەرە ئاین وبەرنامەی خوا وئەملاو

---

(1) - [رَوَاهُ البُخَارِي(١٣/رَقم/٦٥٥٧) وَمُسْلِم(٤/رَقم/٢٨٠٥) وَاللَّفْظُ لَهُ].

(2) - (الروم/ ٣٠)

ئەولا مەکە، ئەمە ئاینی حەق وفیترەتی پاکی خوای گەورەیە کە خەڵکی لەسەر بەدیهێناوە، وە هیچ گۆڕانێکیش بە سەر بەدیهێنانی خوای گەورەدا نایەت، ئا ئەمەیە ئاینی راست ودروست، بەڵام زۆربەی خەڵکی لەم راستیانە بێئاگان.

هەروەها ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێت) دەڵێت: کەوا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: ( مَا مِنْ مَوْلُودٍ إلاَّ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ (وَفِي رِوَايَةٍ لِمُسْلِم: عَلَى المِلَّة) فَأَبُوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ)[1]

واتە: هیچ منداڵێك لە دایك نابێت ئیللا لەسەر فیترەتی پاکی ویەکخواپەرستی لە دایك دەبێت، جا باوك ودایکی دەیکەنە جولەکە یان گاورپەرست یان ئاگرپەرست.

هەروەها لە فەرمودەکەی عیاضی کوڕی حیمار (خوای لێ رازی بێت) دەڵێت کەوا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: خوای گەورە فەرمویەتی:

( ... وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ ، وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِيْنُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِيْنِهِمْ ، وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَاأَحْلَلْتُ لَهُمْ وَأَمَرَتْهُمْ أَنْ يُشْرِكُوا بِي مَالَمْ أُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانَاً.. )[2]

واتە: .. وە من هەمو بەندەکانم لەسەر حەق و ڕاستی و فیرەت پاکی بەدیهێناوە، بەڵام شەیتانەکان هاتن بۆ لایان و لایانیاندا لە ئاینە راستەکەیان، جا ئەوە یان لەسەر حەرام کردن کە من بۆم حەلاڵ کردبون، وە فەرمانیشیان پێکردن هاوبەش بۆ من بڕیاربدەن، کە هیچ بەڵگەیەکم لەسەری دانەبەزاندوە ..

(1) - [رَوَاهُ البُخَارِي(٣/رَقَم/١٣٥٨) وَمُسْلِم (٤/رَقَم/٢٦٥٨)].

(2) - [رَوَاهُ مُسْلِم(٤/رَقَم/٢٨٦٥)]

**سێیەم:** خوای گەورە لە خودی خۆیان پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردن و کتێبیشی لەگەڵدا بۆ ناردون، تاوەکو ئەو بەڵێنەی یەکەم جاریان یاد بخەنەوە و بیانهێننەوە سەر فیترەتی پاك و مژدەی بەهەشتیان پێ بدەن ئەگەر گوێڕایەڵی خوا پاشان پێغەمبەرانی بکەن و بیشیان ترسێنن لە ئاگری دۆزەخ ئەگەر سەرپێچی ونافەرمانی خوای خۆیان بکەن. خوا دەفەرمووێت: **(هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ)**[1] واتە: هەر ئەو زاتەیە لە ناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردوە لە خۆیان، ئایەتە کانی خوای گەورەیان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەرونیان پاك و پوخت دەکات و شارەزایان دەکات لە کتێبەکەی خوا و فێری دانایی و حیکمەتیان دەکات، لەکاتێکدا کە ئەوان لەناو گومڕایی و سەر لێشێوانێکی ئاشکرادا دەژیان.

لەشوێنێکی تردا خوای گەورە دەفەرمووێت :**(إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ)**[2]

واتە: بێگومان _ ئەی پێغەمبەر _ ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە بە حەق و ڕاستیەکی تەواوەوە، موژدەدەر بیت بۆ باوەڕداران وترسێنەریش بیت بۆ ئەوانەی بێباوەڕن، وە هیچ گەل و نەتەوەیەکیش نەبوە کە بێدارکەرەوەی خواییان بۆ ڕەوانە نەکرابێت .

---

(1) - (الجمعة/٢)

(2) - (فاطر/٢٤)

هەروەها دەفەرمووێت: (وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ..)[1]

واتە: وە بێگومان ئێمە بۆ هەمو ئوممەتێك پێغەمبەرێكمان رەوانە كردوە كەوا بەتاك وتەنها پەرستش و بەندایەتی خوای گەورە بكەن و دوور بكەونەوە لە بەندایەتی كردنی ئەوانەی لە سنوری خۆیان دەركراون ..

---

([1]) - (النحل/٣٦)

## پرسیاری چوار:

**پێناسەی پەرستن(العبادة) چییە؟ وە بۆ ئەوەی پەرستنەکانمان وەرگیرێت لای خوای گەورە دەبێت چوار خاڵ لە خۆمان دا جێ بەجێ بکەین ئەو چوار خاڵە چین؟**

## وەڵامی پرسیاری چوار:

پەرستن: لەزمانی عەرەبی دا بە واتای (پابەندبون و مل کەچ کردن و گوێ ڕایەڵی کردن) دێت.

وە شێخی ئیسلام(إبن تیمیة)ش ڕەحمەتی خوای لێبێت لە پێناسەی دا دەفەرمووێت: ( الْعِبَادَةُ هِيَ اسْمٌ جَامِعٌ لِكُلِّ مَا يُحِبُّهُ اللَّهُ تَعَالَى وَيَرْضَاهُ مِنَ الْأَقْوَالِ وَالْأَعْمَالِ الْبَاطِنَةِ وَالظَّاهِرَةِ) واتە: پەرستن: ناوێکی گشت گیرەبۆ ئەوانەی خوا خۆشی دەوێن و پێیان ڕازی یەلە وتەو کردەوە نهێنی و ئاشکراکان.

خوای گەورەش لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: ( وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ)[1]

واتە: ئەی محمد ﴿ﷺ﴾ لەپێش تۆ هەر پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکرد بێت، نیگامان بۆ کردوەتاوەکو بەخەڵکی ڕاگەیەنێت، کەهیچ پەرستراوێك نییە شیاوی پەرستن بێت بەڕاستی بێجگە لەمن و بمپەرستن.

وە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: (وما تقرَّبَ إليَّ عبدي بشيءٍ أحب إليَّ مِمَّا افترضتُهُ عليه)[2] واتە: عەبدەکەم بەهیچ شتێك لێم نزیك نابێتەوە خۆشەویست تر بێت لەلام وەکو ئەوەی کەفەرزم کردووە لەسەری.

---

([1]) - (الأنبياء/٢٥)

([2]) - [صحيح البخاري رقم : (٦٥٠٢)]

هەرکارو کردەوەیەکیش ئەم چوار مەرجەی تێدا بێت بەپەرستن دەژمێردرێت و پاداشتی لەسەر وەردەگیرێت:

**یەکەم: ئەوکەسەی ئەنجامی دەدات دەبێت باوەڕدار بێت.**

چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا)[1]

واتە: هەرکەس کارێکی چاکە بکات، لەنێر یاخود مێ، لەکاتێك دا باوەڕدار بێت، ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و بەئەندازەی تاڵە دەزوویەك ستەمیان لێناکرێت.

**دووەم: مەبەستی لەکردنی ئەوکارە تەنیا ڕەزامەندی خوای گەورەبێت.**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ * لَا شَرِيكَ لَهُ ...)[2]

واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەخەڵکی بڵێ: بە ڕاستی نوێژ و حەیوان سەربڕین و ژیان و مردنم هەمووی بۆ پەروەردگاری هەموو جیهانە. هیچ هاوبەشی نییە.

**سێیەم: کارەکە لەگەڵ پەیامی خوادا بگونجێ و دژی سوننەت نەبێت.** پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی :(مَنْ عَمِلَ عملاً ليسَ عليهِ أمرنا فهو رَدٌّ)[3]

واتە: هەر کەسێك هەر کردەوەیەك ئەنجام بدات کەفەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوا ئەو کردەوەیە ڕەت دەکرێتەوەو قەبوڵ ناکرێت.

---

([1]) - (النساء/١٢٤)
([2]) - (الأنعام/١٦٢-١٦٣)
([3]) - [صحيح مسلم رقم: (١٧١٨)]

## چوارەم: ڕەچاوی پێشینە(أولوية)ی تێدا بکات.

لەفەرموودەیەکی قودسی دا خوای گەورەدەفەرمووێت: **( وما تقرَّب إليَّ عبدي بشيء أحبَّ إليَّ مما افترضتُ عليه)**[1] واتە: بەندەکەم بەهیچ شتێك لێم نزیك نابێتەوەخۆشەویستر بێت لەلام لەوەی کەفەرزم کردوەلەسەری. لەم فەرموودەیەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوا تا جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا پاشان پێغەمبەرەکەی﴿ﷺ﴾ وەستا بێت نابێت بگەڕێین بەدوای کارێك دا کەفەرمانی لەسەر نەکراوە، کەبەداخەوە ئەمڕۆ خەڵکی بەناو مسوڵمان لە جیاتی ئەوەی فەرزەکە بەجێ بگەیەنێت ڕادەکات بەدوای سوننەتێك دا یان کابرا پێنج فەرزە گوێی لەبانگە ناچێت بەدەمییەوە بەس ئامادەیە قەرز بکات تا بچێت بۆ حەج ی ماڵی خوا تاوەکو پێی بڵێن حاجی! کەواتە لێرەدابۆمان ڕوون بۆیەوە کە دەبێت چۆن پەرستنەکانی خوای گەورەجێ بەجێ بکەین؟ نابێت مرۆڤ بەویست و ئارەزووی خۆی پەرستن ئەنجام بدات چونکە لێی وەر ناگیرێت ئەگەرچی لای خۆی کاری چاکیشی ئەنجام داوە!.

---

[1] - (حديث قدسي – روا البخاري)

## پرسیاری پێنج

**بۆچی خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردوە؟**

### وەڵامی پرسیاری پێنج:

خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی بانگەواز بکەن بۆ پەرستنی خوای تاك و تەنها و، وە شیرك و هاوەڵ بڕیاردانی لێ دوور بخەنەوە، هەربۆیە خوای گەورەفەرموویەتی: **(وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ)**[1]

واتە: بۆ هەموو ئوممەتێك (کۆمەڵە مرۆڤـێك) پێغەمبەرێكمان ناردووە بۆ ئەوەی پێیان بڵێ: بە تاك و تەنها خوای گەورە بپەرستن و خۆتان دوور بخەنەوە لە(طاغوت) .

واتە: لەپەرستنی جگە لە خوا پاشان پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾فەرموویەتی:

**(الأنبياء إخوة .. ودينهم واحد)**[2]

واتە: پێغەمبەران برای یەکن و دین و ئایینیشیان یەکێکە.

---

(1)-(النحل /36)

(2) - [متفق عليه / صحيح البخاري رقم : (3443) وصحيح مسلم رقم : (2365)] .

## پرسیاری شەش

**پێناسەی (طاغوت) چییە؟ وەسەرانی (طاغوت) کێن؟**

### وەڵامی پرسیاری شەش:

(طاغوت) ووشەیەکە لەچاوگی (طغیان)ە وەوەرگیراوەو بەواتای لە سنور دەرچوون، دێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: **(إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ)**[1] واتە: کاتێك ئاوەکە سەرڕێژی کرد ئێمە لەکەشتی یەکەدا هەڵمان گرتن.

ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: تاغوت شەیتانە، جابریش (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: تاغوتەکان جادوگەربوون شەیتانەکان دەهاتن بۆلایان، ئیمامی مالیکیش (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: تاغوت هەموو شتێکە بپەرسترێت، بێجگە لەخوای گەورە. ئەمانە هەموویان نمونەن لەسەر (طاغوت) بەڵام واتایەکی لەوە گشتی تری هەیە کە پێشەوا ئیبن القیم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئاماژەی پێ کردووەو فەرموویەتی: تاغوت هەموو شتێکە کە بەندە لە سنوری خۆی بەدەر دایبنێت لە (پەرستراو) یان (شوێن هەڵگیراو) یان (گوێڕایەڵی کراو)، تاغوتی هەر گەلێکیش ئەو کەسەیە کە بێجگە لە خوا پاشان پێغەمبەرەکەی دەیکەن بەدادوەر، یان بێجگە لە خوا دەیپەرستن، یان کوێرانەشوێنی دەکەون، یان لە شتێکدا گوێ ڕایەڵی

(1)- (الحاقة/١١)

دەکەن کە نازانن گوێ ڕایەڵی خوایە و پەرستنە. بۆ ڕون کردنەوەی زیاتر لەم سەردەمەدا بیریاری ئیسلامی ناودار محمد قطب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: تاغوت هەرشتێك یان کەسێك یان نەریتێك یان barودۆخێك یان دەسەڵاتێك یان شەرعێکە کەبەبێ مۆڵەتی خوای گەورە خەڵکی بکاتە کۆیلە و بەندەو داوا لە خەڵکی بکات گوێ ڕایەڵی بکەن یان خەڵکی خۆیان ممارەسەی گوێ ڕایەڵی کردنی بکەن وە بەگوێ ڕایەڵی کردنەکەی سەرپێچی فەرمانی خوای گەورەبکەن.

**(طاغوتان) زۆرن بەڵام سەرانیان ئەم پێنجەن:-**

یەکەم: **ئیبلیس و اتە(شەیتان):-** چونکە یەکەم بەندەی یاخی و سەرکەشەو لە بەزەیی خوای گەورەبێ بەش کراوە نەفرینی یەکجاری لێکراوە، هەروەها هەمیشە لەدەرفەت دەگەڕێت بۆ ئەوەی بەندەکان لەخشتەبەرێت و سەر پێچی خوای گەورەبکەن.

**دووەم: کەسێک بپەرسترێت و خۆشی پێی ڕازیبێت:-** چونکە خەڵکی پێیەوە گیرۆدە دەبن و لە خواپەرستی ڕاستەقینە دوور دەکەونەوە، لە کاتێکدا ئەم بە ئاسانی دەتوانێت ڕێگری خەڵکی بکات لەو پەرستنەو دەست بەرداری ببن، لە ژیانی دا یان لە دوای مردن.

**سێیەم: کەسێك بانگی خەڵکی بکات بۆ ئەوەی بیپەرستن:-** کەسێك کاری وای لێ بوەشێتەوە بێگومان تەواو شوێنی لێ هەڵکێشاوەو یەکجار سەرکەشە و خۆی بە خوای خەڵکی داناوەو دووریان دەخاتەوە لە خواپەرستی، ئینجا بە دەمیەوە بێن یان گوێی پێنەدەن هەر تاغوتە.

**چوارەم: کەسێك لافی غەیب زانی لێ بدات:-** چونکە بانگەشەی سیفەتێکی چەسپاوی خوای گەورە بۆ خۆی دەکات و خەڵکی گومڕادەکات و بیروباوەڕیان دەشێوێنێت.

**پێنجەم: کەسێك حوکم بەغەیری بەرنامەی خوا بکات:-** ئاشکرایە لە ژیانی کۆمەڵگادا دووجۆر حوکم ڕانی پیادەدەکرێت، یان حوکمی جاهیلی یان حوکمی خوا، چونکەخوای گەورەدەفەرمووێت: **(أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَوَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ)**[1] واتە: ئایا مەبەستیانە حوکمی جاهیلی پیادە بکەن؟ باشەحوکمی کێ لە هی خوا چاکترە بۆ گەلێك باوەڕیان دامەزراوبێت.

جا کەسێك پیادەی حوکمی جاهیلی بکات لەژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکی دا ئەوا گەلێك یاخییەو سەرکەشییەکەی دەگاتە پلەی تاغوت.

(1)-(المائیدة/٥٠)

## پرسیاری حەوت

**مانای(لا إله إلا الله)چییە؟ وەمەرجەکانی(لا إله إلا الله) چین؟**

وەڵامی پرسیاری حەوت:

مانای **(لا إله إلا الله)** واتە( :**لا معبود بحق إلا الله)** هیچ پەرستراوێك نیە بەڕاستی بپەرسترێت بێجگەلە ألله.

لەمانای **(لا إله إلا الله)** دا کۆمەڵێك لە مسوڵمانان بەم جۆرە مانای دەکەن کەواتای تەواو ناپێکێت کەدەڵێن هیچ خوایەك نیەبێجگە لە **(ألله)** ووشەی **(بحق)** بەکار ناهێنن واتە بەڕاستی پەرستنی خوای گەورەکە **(ألله)** یەدەبێت لەمانای دا بەکار بهێنرێت بۆ ئەوەی ڕوون ببێتەوە بۆ خەڵکی کەوا ئەوا نەی لەغەیری **(ألله)** بانگەشەی خوایەتی دەکەن چەوا شەکارن و خەڵکی گومڕا دەکەن چوونکە فیرعەونیش دەیووت **(أنا ربکم الأعلی)** کەوا تەدەبێت بۆ ناسینی خوای گەورەجوانترین مانای بۆ بکرێت کەوا ئینسان ئاوێتەی ئەم خوا ناسینە بێت نەك پێمان وا بێت بەم مانا کوورتە کە دەڵێین هیچ خوایەك نیە بێ لە **(ألله)** وا بزانن مانای **(لا إله إلا الله)**مان کردووە، ئەویش بەوە دەبێت کە مەرجەکانی **(لا إله إلا الله)** بەتەواوەتی بزانین وەبەکردەوەش بیسەلمێنین ئەو کات دەتوانین حەقی **(لا إلهإلا الله)** بدەین.

**مەرجەکانی (لا إله إلا الله) ش**

هەرکەسێك شایەتی بدات بە**(لا إله إلا الله)**دەبێتەمسوڵمانی ڕاستەقینەئەگەر ئەم مەرجانەی تێدا بێتەدی:

**یەکەم: (العلم)** زانینی واتاکەی: بریتیە لەڕەت کردنەوەی پەرستراویەتی غەیری خواو چەسپاندنی بۆ خوای گەورە،وەك دەفەرموێت:
**(فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ)**[1]
واتە:- بزانە کە هیچ پەرستراوێك نیە بەڕاستی بپەرسترێت بێجگە لەخوا.
پێغەمبەری خواش ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: **(مَن ماتَ وهو يَعْلَمُ أنَّه لا إلهَ إلَّا اللَّهُ، دَخَلَ الجَنَّةَ)**[2]
واتە:- هەر کەس بمرێت وبزانێت کەهیچ پەرستراوێك نیەبەڕاستی بپەرسترێت بێجگەلەخوا دەچێتەبەهەشتەوە.
**دووەم: (اليقين)** دڵنیابوون: واتەبەدڵ بڕوای پێبکرێت وهیچ گومانێك بەرانبەری نەمێنێت،چوونکەخوای گەورە دەفەرمووێت:**(إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ)**[3]
واتە: هەر ئەوانە باوەڕ دارن کە باوەڕیان بەخواو پێغەمبەرەکەی هێناوە، پاشان گومانیشیان نە بووە.
**سێیەم: (القبول)** ڕازی بوون: بەوەی لەم ووشە پیرۆزە دەفامرێتەوە بەدڵ و زمان، خوای گەورە دەربارەی بێباوەڕان دەفەرمووێت:**(إِنَّهُمۡ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسۡتَكۡبِرُونَ)**[4]
واتە:- ئەگەر بەو بێباوەڕانە بووترایەهیچ پەرستراوێك نیەبێجگەلەخوای گەورەخۆیان بەزل دەزانی و لووت بەرزیان دەکرد.

---

([1])- (محمد/١٩)
([2]) – (رواه مسلم)
([3]) – (الحجرات/١٥)
([4]) - (الصافات/٣٥)

**چوارەم: (ألأنقیاد)** مل کەچ کردن و پابەندبوون: بەواتاکەیەوە، خوای گەورە دەفە رموێت:( وَ أَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُ )[1]

واتە:- بگەڕێنەوە بۆ لای پە روەردگارتان و مل کەچی بن.

**پێنجەم: (الصدق)** ڕاستگۆیی: لەباوەڕبوون بە(**لا إله إلا الله**)دا،خوای گەورە دەفەرمووێت: (الٓمٓ) أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ) وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ )[2]

واتە: ئەلیف، لام، میم، ئایا خەڵکی وای دادەنێن کەوازیان لێبهێنرێت، هەر بەوەندەی بڵێن: باوەڕمان هێناوە دەست بەرداریان ببین و تاقی نەکرێنەوە، بێگومان ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقی کردۆتەوە، بۆ ئەوەی خوای گەورە بزانێت ئەوانەکێن کەراستیان کردووەو ئەوانەشی بۆ دەرکەوێت کە درۆزنن.

پێغەمبەری خواش﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت:( مَا مِنْ أَحَدٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صِدْقًا مِنْ قَلْبِهِ إِلاَّ حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ)[3]

واتە: هەر کەسێك شایەتی بدات بەوەی هیچ پەرستراوێك نیە بەڕاستی بپەرسترێت بێجگە لەخوا پاشان محمد﴿ﷺ﴾ بەندەو نێردراوی خوایە، بەڕستگۆیی و لە دڵیەوە ئەوا خوای گەورە ئاگری دۆزەخی لێ قەدەغە دەکات.

(1)-(الزمر/٥٤)

(2) - (العنكبوت/١-٣)

(3) - (متفق عليه)

**شەشەم: (الإخلاص)** نیاز پاکی و دڵسۆزی: لە ووتنی**(لا إله إلا الله)**دا، چوونکە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەفە رموویت: **(فإن الله حرَّم على النار مَنْ قال: لا إله إلا الله، يَبْتَغِي بذلك وجهَ الله)**[1]

واتە: خوا ئاگری دۆزەخی لەکەسێك قەدەغە کردووە بڵێت **(لا إله إلا الله )**و مەبەستی ڕەزامەندی خوای گەورەبێت ڕووپامایی تێدا نەبێت واتە کارەکەی بۆ خوا بێت نەك بۆ خەڵکی.

**حەوتەم: (المحبة)**خۆش ویستنی: ئەم ووتە شیرینەو ناوەڕۆکەکەی و ئەوانەی پابەندی دەبن ورق لێبوونەوە لەوانەی سەرپێچی و دژایەتی دەکەن، پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەفە رموویت: **(ثلاثٌ مَنْ كُنَّ فيه وجَدَ حلاوَةَ الإيمانِ: أنْ يكونَ اللهُ و رسولُهُ أحبَّ إليه مِمَّا سِواهُما ، و أنْ يُحِبَّ المرْءَ لا يُحبُّهُ إلَّا للهِ ، و أنْ يَكْرَهَ أنْ يَعودَ في الكُفرِ بعدَ إذْ أنقذَهُ اللهُ مِنْهُ ؛ كَما يَكرَهُ أنْ يُلْقى في النارِ)**[2]

واتە: سێ سیفەت هەن لەهەر کەسێك دا بێت شیرینی باوەڕی دەست دەکەوێت پێیان,دەبێت خواو پێغەمبەرەکە ی لەلا خۆ شەویستر بێت لەهەموو شتێکی تر،وەهەر کەسێکی خۆش ویست لە بەر خوا خۆشی بوێت، وەپێی ناخۆش بێت کە بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی دوای ئەوەی خوای گەورە ڕزگاری کردووەلێی هەر وەك پێی ناخۆشەفرێ بدرێتە ناو ئاگرەوە.

---

([1]) - ( رواه البخاري ومسلم)

([2]) - (متفق عليه)

**هەشتەم: باوەڕنەبوون وکوفرانەکردن بە( الطاغوت):**

واتە: ئەو شتانەی کە دەپەرسترێن بێجگە لە خوا: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت:( من قال: لا إِلَهَ إلا الله، وَكَفَرَبِمَا يُعْبَدُ من دُونِ اللَّهِ، حَرُمَ مَالُهُ وَدَمُهُ، وَحِسَابُهُ على اللَّهِ )[1]

واتە:هەر کەسێك بڵێ (**لا إله إلا الله**) و کوفرانە بەوانەبکات کەدەپەرسترێن بێجگەلەخوا ،ماڵ و خوێنی حەرام دەبێت.

ئەمانە ئەو مەرجانەبوون کەپێویستەلەکە سێکدا بێنەدی کەبڵێت(**لا إله إلا الله**) و بەپێی فەرموودەکان شایستەی بەهەشت بێت.

**تێبینی:** زۆرینەی زانایان ڕەحمەتی خوایان لێبێت مەرجەکانی (**لا إله إلا الله**) یان کردووە بە حەوت بەشەوە بەڵام هەندێکی تریان بۆ زیاتر ڕووون کردنەوە بەپێویستیان زانیوە کەوا دەبێت ئەم خاڵەشیان بۆ زیاد کردوە کەدەکاتە هەشت مەرج بۆ زیاتر بەرچاو ڕۆشنی مسوڵمانان لەم سەردەمەدا.

---

(1) - (رواه مسلم)

## پرسیاری هەشت

**پێناسەی یەکخواپەرستی(تەوحید)چییە؟ وە چەند جۆریەکخواپەرستی (تەوحید)مان هەیە؟**

### وەڵامی پرسیاری هەشت:

**یەکخواپەرستی**:- بریتییە لە بەتەنها ناسینی خوای گەورە لە پەروەردگاریەتی (**الربوبیة**)و، پەرستراویەتی و(**الأولوهیة**)و، ناوسیفەتەکانی (**الأسماء صفاة**) دا.

**بەم پێیە یەکخواپەرستی دەکرێت بەسێ بەشەوە:**

**یەکەم: یەکخواپەرستی پەروەردگاریەتی (توحید الربوبیة)**: بریتییە لە بە تەنها ناسینی خوا لە کارو فەرمانیدا وەکو دروستکردن و بەڕێوەبردن و مشور خواردن مراندن ورۆزی دان و سوود گەیاندن وزیان گەیاندن و ... هتد

خوای گەورەفەرموویەتی :(**الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**)[1].

واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەموو جیهانە .

**وەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:- (أنتَ رَبُّ السَّماواتِ والأرض)**[2]

**و اتە : خو ایەتۆپەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویت.**

(**الرَّبُّ**): **هو الخالقُ المالِكُ المُدَّبِر** ، واتە : پەروەردگار بریتییە لە: بە دیهێنەر و خاوەن و بە ڕێوەبەر.

---

(1) - (الفاتحة / 2)

(2) - [متفق علیه / صحیح البخاري رقم : (٧٣٨٥) وصحیح مسلم رقم : (٧٦٩) ]

**دووەم: یەکخوا پەرستی پەرستراویەتی (توحید الألوهیة)**: بریتییە لە بەتەنها ناسینی خوا لەپەرستن دا بەهەمو شێوەکانییەوە، وەکو: دوعا و پاڕانەوەو ئاژەڵ سەربڕین و نەزرکردن نوێژوو ڕۆژوو حەج کردن و زەکات دان و ملکەچی و شوێن کەوتن ... هتد ، خوای گەورەفەرموویەتی :**(وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ)**[1]

واتە: پەرستراوی ئێوە تەنها یەك پەرستراوە کەهیچ پەرستراوێك نیە شایستەی پەرستن بێت جگە لەئەو نەبێت کەوا خاوەنی ڕەحمەتێکی فراوانەو بەبەزەییە.

وەپێغەمبەر ی خوا(ﷺ) فەرموویەتی : **(فلْيَكُنْ أوَّلَ ما تدعوهم إليهِ : شهادة أنْ لا إلهَ إلاَّ اللهُ)**[2]

واتە: با یەکەم شت کە بانگەوازیان دەکەیت بۆ لای بریتی بێت لە: شایەتی دان بەوەی کە: هیچ پەرستراوێك نیە شایستەی پەرستن بێت بەڕاستی جگە لە (اللە) نەبێت.

وەلەڕیوایەتەکەی (البخاري)دا هاتووە: **(إلى أنْ يوحدوا الله)**[3]

واتە: با یەکەم شت کەبانگەوازیان دەکەیت بۆ لای بریتی بێت لە: یەکخواپەرستی، بە واتایەکی تر : بەتەنها خوا بپەرستن.

---

(1)-(البقرة / ١٦٣).

(2)-[متفق عليه / صحيح البخاري رقم : (١٤٩٦) وصحيح مسلم رقم : (١٩)] .

(3)-[صحيح البخاري رقم : (٧٣٧٢) ]

**سێیەم: یەکخواپەرستی لەناووسیفەتەکانیدا (توحید الأسماء والصفات)**
بریتیە لە سەلماندنی ئەوەی کە خوا وەسفی خۆیی پێ کردووە لە قورئاندا، یان ئەوەی کە پێغەمبەرەکەی﴿ﷺ﴾ وەسفی پێ کردووە لە فەرموودە صەحیحەکانیدا بەحەقیقەت، هەروەها بەتەنها ناسینی خوا لەو ناوانەدا کە خۆی پێ ناوناون و لەو سیفەتانەدا کەخۆی پێ وەسف کردوون، بەبێ مانا گۆڕین( تأویل )و، بەبێ شێواندن(تحریف) و، بەبێ وێنە (تمثیل) و، بەبێ لە کارخستن(تعطیل)و، بەبێ چۆنایەتی(تکییف)و، بەبێ لێچواندن(تشبیه)، بۆ نموونە: وەکو (استواء)کردن لەسەر عەرش و دابەزین بۆ ئاسمانی دونیا و دەست و جگە لەمانەش لەو سیفەتانەی کەلایەقن بۆ کامڵێتی الله تعالی، خوای گەورە فەرموویەتی : **(لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ)**[1]
واتە : هیچ شتێك وەکو خوا نییەو خواش بیسەر و بینەرە.
وە پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی :**(ينزل اللهُ في كُلِّ ليلةٍ إلى سماء الدنيا ...)**[2]
واتە : هەموو شەوێك خوا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا...
دادەبەزێت: واتە دابەزینێك کە لایەق بێت بە گەورەیی خواوە، کە لێکچواندنی تێدا نیە بەهیچ یەکێك لەدروستکراوەکانی.

---

(1) - (الشورى /١١)
(2) - [صحيح مسلم رقم : (٧٥٨)

## پرسیاری نۆ

**پێناسەی هاوبەش پەیداکردن(الشرك) چییە؟ وە چەند جۆر هاوبەش پەیداکردنمان هەیە؟**

### وەڵامی پرسیاری نۆ:

**هاوبەش پەیداکردن:** بریتییە لەوەی مرۆڤ شتێک یان کەسێك بکات بە هاوبەشی خوای گەورە لەو فەرمانانەدا کە مافی ڕەوای خوای گەورەن و هیچ کەسێك شایستە نییە، بۆی ئەنجام بدرێن بێجگە لەخوای گەورە، وەك دانانی پەرستراوی تر لەگەڵ خوادا کە بیپەرستێت، یان گوێ ڕایەڵی بکات، یان خۆشی بوێت، یان داوای یارمەتی لێ بکات کە لەدەسەڵاتی ئەودا نەبێت یان ...... هتد. هەر بۆیە ئەگەر کەسێك وا ڕەفتار بکات ئەوا هاوبەش دانانی گەورەی ئەنجام داوەو دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی کردەوە چاکەکانیشی وەڕەنگە خوا لە هەموو تاوانەکانی خۆش بێت بەڵام لەهاوبەش دانانەکەی خۆش نابێت وەك دەفەرمووێت: **(لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ)**[1]

واتە: ئەی محمد ﷺ ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێیت ئەوا کردەوەکانت پووچەڵ دەبنەوە. خوا پەنای ئێمە بدات کە چەندێک بێ ئاگاین لەم تاوانە گەورەیە، کەوابوو دەبێت بزانین کە گەورەترین تاوان بریتییە لە شەریك بڕیاردان بۆ خوا، بەڵگەش خوای گەورەفەرموویەتی: **(وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ)**[2]

---

([1]) - (الزمر/٦٥)

([2]) - (لقمان/ ١٣)

واتە: لوقمان ووتی بەکوڕەکەی لەکاتێکدا کەئامۆژگاری دەکرد: ئەی کوڕی شیرینم شەریك بۆ خوا بڕیارمەدە چونکە شیرك گەورەترین ستەم و تاوانە.
وەکاتێ پرسیار کرا لەپێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ : **(أيُّ الذنب أعظم ؟ قال : أنْ تجعلَ للهِ نِدّاً وهو خلقك !)**[1]

واتە: ئایا گەورەترین تاوان بریتیە لەچی ؟ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: گەورەترین تاوان ئەوەیە کەشەریك و هاوشێواز و هاوەڵ بۆ خوا دابنێیت لە کاتێکدا کەتەنها ئەو تۆی درووست کردووە.

**جۆرەکانی (هاوبەش پەیداکردن)یش دوو جۆرە:**

**یەکەم: هاوبەش پەیداکردنی گەورە(الشرك الأكبر):**

ئەو هاوبەش دانانەیە کە بەتەواوەتی بیرو باوەڕی یەکخواپەرستی هەڵدەوە شێنێتەوەو بەهەشت لە خاوەنەکەی قەدەغە دەکات خوای گەورە لێی خۆش نابێت خوا پەنامان بدات نمونەی ئەم شیرکە گەورەیە زۆرن لەوانە: پاڕانەوە لە غەیری خوا، سەربڕین بۆ غەیری خوا، ترسان لەغەیری خوا، باوەڕبون بەوەی خوای گەورەکوڕ یان کچ، یاخود یاریدەدەری هەیە، حەڵاڵ کردن یان حەرام کردنی شت بەپێی ئارەزوو، وە داوای فریاکەوتن لەمردووەکان یان زیندووانی نادیار، خوای گەورە فەرموویەتی :**(وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا)**[2] واتە: بەتەنها خوا بپەرستن و هیچ شەریکی بۆ ئەنجام مەدەن.

---

(1) - [متفق علیه / صحیح البخاري رقم : (٤٧٦١) وصحیح مسلم رقم: (٨٦)]

(2) - (النساء/ 36)

وە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: (أكبر الكبائر : الإشراك بالله ...)[1]
واتە: گەورەترین تاوان لەتاوانە گەورەکان: شیرك ئەنجامدان و هاوەڵ بڕیار دانە بۆ خوای گەورە.

**دووەم: هاوبەش پەیداکردنی بچووك(الشرك الأصغر):**

بریتییە لەو تاوانە گەورانەی مەترسییان لێ دەکرێت خاوەنەکانیان بەبێباوەڕی بمرێت ئەگەر خوای گەورەفریای نەکەوێت وەپێش مردنی تەوبەنەکات، ئەمیش دەبێت بەدوو بەشەوە:

**١. هاوبەش دانانی بچوکی ئاشکرا:**

ئەم جۆرەیان نمونەی زۆرە، لەوانە: سوێند خواردن بەغەیری خوا نابێت مرۆڤی باوەڕ دار لەغەیری خوا سوێند بخوات تەنانەت بەپێغەمبەری خواش ﴿ﷺ﴾ نابێت چی جای ئەو هەموو گومڕایەتییەی ئەمڕۆ کەبەدایك و باوکیشەوە ناوەستن تا چەندین ناوو نازناوی تریش پەنا بەخوا، خوای گەورە فەرموویەتی: (قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ)[2]
واتە : ئەی پێغەمبەرپێیان بڵێ: بەڵێ سوێند بەخوای پەروەردگارم زیندوو دەکرێنەوە .

وەپێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی : (مَنْ حلفَ بغير الله فقد أشركَ)[3]واتە: هەرکەسێك سوێند بخوات بە غەیری خوا ئەوا شیرکی کردووە.

---

(1) - [صحيح البخاري رقم : (٦٨٧١) ]
(2) - (التغابن /٧)
(3) - [صحيح رواه أحمد : (٢ / ٣٤ ، ٨٦) ــ وصححهُ الألباني فــي صحيح أبــي داود رقم : (٣٢٥١) وصحيح الــجامع الصغيررقم : (٦٢٠٤)].

هەروەها پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی :**(مَنْ كان حالفاً فلْيَحلِفْ باللّه أو لِيَصْمُتْ)**[1]واتە : هەر کەسێك سوێندی خوارد ئەوا با سوێند بەخوا بخوات یاخود با بێ دەنگ بێت .

یان هەڵواسینی تەمیمە واتە ئەوشتانەی کە بەزۆری بەمنداڵ و خانوودا هەڵدەواسرێن بەبیانوی دورخستنەوەی جنۆکەو یان ناهێڵن چاو کاری تێبکات، یان لەدەست کردنی دەستەوانەو موفەڕك، یان نوشتەکردن بەغەیری ئایەتی قورئان و زمانی عەرەبی یان پێی وایە نوشتەکە چاکی دەکاتەوە ئەمانەو چەندینی تر هەن کەپێیان دەوترێت هاوەل پەیدا کردنی بچوکی ئاشکرا. پەنا بەخوای گەورە

**٢. هاوبەش دانانی بچوکی شاراوە:**

بریتییە لەهاو بەش دانان بۆ خوای گەورە لەنیازو مەبەستەکاندا، وەك ئەوەی کارێك یاخود قسەیەك بکات بۆ ڕوپامایی(ریاء) یان بۆ ناوبانگ دەرکردن، پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: **(الشرك فيكم أخفى من دبيب النمل ......)**[2] واتە: هاوبەش دانان لەناو تان دا لەخشپەی مێروولە شاراوەترە.

خوای گەورە فەرموویەتی : **(فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا)**[3]

---

([1]) - [صحيح البخاري رقم : (٢٦٧٩)

([2]) - (صحيح الجامع:ر/3625)

([3]) - (الكهف /١١٠)

واتە: هەر كەسێك ئومێدی ئەوەی هەیە كەبگاتە خوای پەروەردگاری ئەوا با كردەوەی چاكە بكات و لەپەرستنی پەروەردگاریدا كەس نەكات بەشەریكی .

وە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: **(إنَّ أخوفَ ما أخافُ عليكم الشركُ الأصغر: الرياء)**[1]واتە: ترسناكترین شت كەلێی بترسم تووشتان ببێت شیركی بچووكەكە: (ریا)یە.

وە بەشێكە لەشیركی بچووك ووتەی ئەو كەسەی كەدەڵێت: ئەگەر خوا و فڵان نەبوایەت .. یان دەڵێت: ئەگەر خوا و تۆ ویستان لێ بێت. پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی : **(لا تقولوا : ما شاء اللهُ وشاء فلان ، ولكن قولوا : ما شاء اللهُ ثُمَّ شاء فلان)**[2]

واتە: مەڵێن : ئەگەر خوا ویستی لێ بێت و فڵان ویستی لێ بێت، بەڵكو بڵێن: ئەگەر خوا ویستی لێ بێت پاشان فڵان ویستی لێ بێت.

---

([1]) -[صحيح رواه أحمد : (٥ / ٤٢٨) وصححهُ الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٩٥١)]

([2]) - [صحيح أبي داود رقم : (٤٩٨٠)]

## پرسیاری دە

**خوای گەورە لەکوێیە؟ وە کورسی خوای گەورە چەندێکە؟وە عەرشی خوا لە چاو کورسییەکەی چەندێکە؟**

### وەڵامی پرسیاری دە:

خوای گەورە لەسەر (**عەرش**)ە لەسەرووی ئاسمانەکانەوە، خوای گەورە فەرموویەتی : **(الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى)**[1].واتە : خوای میهرەبان لەسەر عەرشە.

واتە: (بەرزبووەتەوەبەسەر عەرشدا (وەکو چۆن لە (صحيح البخاري)دا هاتووە.

وە پێغەمبەر ی خوا ﷺ فەرموویەتی : **(إنَّ اللهَ كتبَ كتاباً ... فهو عندهُ فوق العرش)**[2] واتە: خوا کتێبێکی نووسیوەکەلە لای خۆیەتی لەسەر عەرش.

**پرسیار کرا لەئیمامی مالیکی کوڕی ئەنەس(ڕەحمەتی خوای لێبێت) کە** یەکێکە لەپێشەوایانی مەدینە لە سەردەمی خۆیدا وە هەروەها یەکێکە لەچوار ئیمامەکە دەربارەی ئەم ئایەتە **(الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى)** مانای (**اسْتَوَى**)چییە؟ فەرمووی: **(الاستواء معلوم والكيف مجهول والإيمان به واجب والسؤال عنه بدعة)** واتە: (الاستواء) ئاشکراو دیارە بەمانای چی دێت، وچۆنیەتیەکەی نەزانراوە، وباوەڕ بوون پێی واجبە، وە پرسیار کردن دەربارەی بیدعەیە.

---

[1] - (طه /5)

[2] - [متفق عليه / صحيح البخاري رقم : (٧٤٥٤) ]

**سەبارەت بەگەورەیی کورسی خوای گەورەش:** خوای گەورەدەفەرمووێت: **(وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ)**[1] واتە: کورسی خوای گەورەبەئەندازەی ڕووبەری ئاسمانەکان و زەوی فراوانە.

هەروەها دەفەرمووێت: **(وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ)**[2] واتە: ئاسمانمان بەهێز بنیات ناوەو ئێمەس فراوانی دەکەین.

وەسەبارەت بەگەورەیی کورسی و عەرشی خوای گەورەو گەورەیی ئاسمانەکان لەچاو کورسی داو وەکورسی لەچاو عەرشی خوای گەورەدا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لە فەرموودەیەك دا زۆر بەجوانی بۆمانی ڕوون دەکاتەوە کە دەفەرمووێت: **( مَا السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ فِي الْكُرْسِيّ إِلَّا كَحَلْقَةٍ مُلْقَاةٍ فِي أَرْضِ فَلَاةٍ، وَفَضَلُ الْعَرْشِ عَلَى الْكُرْسِيّ كَفَضْلِ الْفَلَاةِ عَلَى تِلْكَ الْحَلْقَةِ)**[3]

واتە: گەورەیی حەوت ئاسمانەکان لەچاو کورسی خوای گەورەدا وەك ئەڵقەیەك وایەلەدەشتێکی چۆڵدا فڕێ درابێت،وەگەورەیی عەرش بەسەر کورسی دا وەك گەورەیی ئەو دەشتەچۆڵە وایە لەچاو ئەو ئەڵقەیەدا .

هیوادارم چەند جارێك بچیتەوە بەسەر فەرموودەکەدا تا جوان لێی حاڵی ببیت چونکە ئەقڵی کورت بینی ئێمە هەر چۆنێك بیری لێ بکاتەوە ئەو جا پەی پێ نابات ئیتر نازانم چۆن مرۆڤ دەتوانێت سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە بکات لەکاتێك دا کورسی خوا تەنیا شوێنی پێی پیرۆزیەتی!!؟

---

(1)- (البقرة/٢٥٥)

(2) - (الذاريات/٤٧)

(3) - (وصحَّحه ابنُ القيم، والألبانيُّ في الصحيحة(١٠٩).

## پرسیاری یانزە

**دۆستایەتی(الولاء)و بەری بوون(البراء) چییە؟ئایا دەبێت دۆستایەتی و بەری بوون مان بۆ کێ بێت؟**

### وەلامی پرسیاری یانزە:

**دۆستایەتی (الولاء) لە ڕووی زمانەوانی یەوە:** کە لەزۆر کتێبی زمانەوانی دا، واتاکەی ئەوەیە کە دووکەس شەڕیان ببێت یەکێك بچێتە نێوانیانەوە ڕێکیان بخات و شەڕ نەکەن بەڵام ئەو کەسە ئەگەر لایەنی کەسێکیان بگرێت بە مەدەوترێت(**دۆستایەتی**).

**دۆستایەتی(الولاء) لەڕوی زارەوەی شەرعییەوە بریتییە لە:** سەرخستن و خۆشەویستی و بەخشندەیی و ڕێزو لایەنگیری بەئاشکراو نهێنی، خوای گەورە فەرموویەتی: **(ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ)**[1] واتە: خوا سەر خەرو لایەنگیری باوەڕدارانە لە تاریکی یەوە بۆ ڕووناکی، بەڵام بێ بڕوایان لایەنگیری یان طاغوتە لەڕوناکییەوە دەیان بات بۆ تاریکی، ئەوانە هاوەڵی ئاگرن و بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

لەشوێنێکی تردا خوای گەورە فەرموویەتی : **(وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ)**[2] واتە: پیاوانی ئیماندار و ئافرەتانی ئیماندر هەندێکیان دۆستی هەندێکی تریانن.

---

(1) - (البقرة/٢٥٧).

(2) - (التوبة/ ٧١)

وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: **(المُؤمنُ للمُؤمنِ كالبُنيانِ يَشُدُّ بعضهُ بعضاً)**[1]واتە: ئیماندار بۆ ئیماندار وەکو بینا وایەهەندێکی هەندێکی تری توندوتۆڵ تر دەکات.

**بەری بوون(البراء) لەڕوی زمانەو انییەوە:** بەو کەسە دەوترێت کە لەیەکێك یان شتێك ڕزگاری بێ لێی دوور بکەوێتەوەوە خۆی لێ پاك بکاتەوە، وە هەروەها بەو کەسەدەوترێت کەبەهانەی نەمێنێ! چوونکە ئاگادار کراوەتەوە، وەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: **(بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ)**[2]واتە: خوا پاشان پێغەمبەرەکەی بەرین لەو هاوەڵ پەیدا کەرانەی کە پەیمانتان لەگەڵدا بەستوون و(ئەوان پەیمانەکە یان شکاندووە).

**بەری بوون(البراء) لەڕوی زاراوەی شەرعییەوە:** واتە: دوورکەوتنەوەو ڕزگار بون و دووژمنایەتی بەهانە نەمان و ئاگادار کردنەوە.

بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم پێناسەیە شیجی ئیسلام ئیبن تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: لایەنگیری دژی دووژمنایەتی یە وە بنچینەی لایەنگیری خۆشەویستی و نزیك بونەوەیە، وە بنچینەی دوژمنایەتی ڕق و کینەو دوور کەوتنەوەیە.

وە ئەگەر لایەنگیری خوا بریتی بێت لە شوێن کەوتنی و ڕێکەوتن لەگەڵیدا لەوشتانەی کەخۆشی دەوێت و ڕەزامەندی لەسەریەتی یان ئەوانەی کەڕقی

---

(1) - [صحيح البخاري رقم : (481) وصحيح مسلم رقم : (٢٥٨٥)] .

(2) - (التوبة/١)

لێیەتی و پێی ناخۆشە وە یان دژی دەوەستێ کەواتە دووژمنایەتی لایەنگیری خوا دوژمنایەتی خوایە وەك لەقورئان دا دەفەرمووێ: **(يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّى وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ)**[1]

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوەدوژمنی من و پاشان خۆتان مەکەن بەلایەنگیری خۆتان و خۆستان بوێت. واتەئەو کەسەی دوژمنایەتی لایەنگیری خوای کرد ئەوا دوژمنایەتی خوای کردوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾فەرموویەتی: **(من عاد لي وليا فقد بارزني بالمحاربة)**[2]

واتە: ئەوەی دوژمنایەتی لایەنگیرێکی من بکات وەك ئەوە وایەکە زۆرانبازیم لەگەڵ بکات.

(1) - (الممتحنة/١)

(2) - (البخاري ٣٤٣/١١)

## پرسیاری دووانزە

### پێویستە مسوڵمانان حوكم بەچی بكەن؟

### وەڵامی پرسیاری دوو انزە:

پێویستە موسڵمانان دادوەری و حوكمڕانی بكەن بەقورئان و فەرموودە صەحیحەكانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾، خوای گەورە فەرموویەتی: **(وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ اللّهُ)**[1]واتە: حوكمڕانی لە نێوانیاندا بكەبەوەی كەخوا دایبەزاندووە.

وە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾**فەرموویەتی: (عالِمُ الغيبِ والشهادة أنتَ تَحكُمُ بين عِبادِكَ)**[2]. واتە: ئەی خوای زانا بەشتە پەنهانی و بەرچاوەكان تۆ بە تەنها حوكمڕانی نێوان بەندەكانت دەكەیت.

كەواتەدەبێت مسوڵمانان هەوڵ بدەن شەریعەتی خواو پێغەمبەرەكەی بچەسپێنن لەسەر زەوی دا و، دوور كەونەوە لەگشت یاسایەكی دەسكرد كە خودی ئینسان دایڕشتوە، هەر بۆیە كاتێك موسڵمانان سەر دەكەون ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای پەیڕەوكردنی كتێبەكەی خوای پەروەردگاریان (**قورئان**)، پاشان سوننەتی پێغەمبەرەكەیان ﴿ﷺ﴾، و دەست بدەنە بڵاوكردنەوەی یەكخواپەرستی (**نشر التوحيد**)، و ئاگادار كردنەوەو ورياكردنەوەی خەڵكی لەشیرك بەهەموو شێوازەكانی یەوە، و خۆیان ئامادەبكەن بۆ رووبەڕوو بوونەوەی دووژمنەكانیان بەو هێزەی كەلەتواناياندا هەیە،

---

(1) - (المائدة/ ٤٩)

(2) -[صحيح مسلم رقم : (٧٧٠)]

خوای گەورە فەرموویەتی :(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ)[1]

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کەوا ئیمانتان هەیەئەگەر ئێوە دینەکەی خوا سەربخەن ئەوا خوای گەورەش ئێوە سەردەخات و پێتان جێگیر دەکات.

هەروەها فەرموویەت: ( وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا)[2]

واتە: خوا پەیمانی داوەبەو کەسانەی کەئیمانیان هێناوە لە ئێوەو کردەوەی چاکە دەکەن کەوا نیشتەجێ و جێگیریان بکات لەزەویدا هەروەکو چۆن ئەوانەی پێش ئەوانی نیشتەجێ و جێگیر کرد و دینەکەیان بۆ جێگیر و دامەزراو بکات ئەو دینەی کەوا ڕازی بووەپێ بۆتان و لەدوای ئەوە ئەو ترسەی کە هەیانە بۆیان بگۆڕێتەوە بەئەمن و ئاسایش بۆ ئەوەی بەتەنها من بپەرستن و هیچ هاوبەشێکم بۆ ئەنجام نەدەن.

---

(1) - (مُحمَّد /٧).

(2) - (النور/٥٥)

## پرسیاری سیانزە

**خوای گەورە کە خالق و دروستکاری سەرجەم بونەوەرە ئەم سێ دروست کراوەی لەچی دروست کردووە؟ (فریشتە - پەری – مرۆڤ)؟**

### وەڵامی پرسیاری سیانزە:

تەنها ڕێگەی زانینی چۆنییەتی دروست کرانی(**فریشتە - پەری – مرۆڤ**) قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری خوایە﴿ﷺ﴾ کە بەئەندازەی ئەوەی ڕوانگەیەکمان بۆیان هەبێت سیفەتی ئەم دروست کراوانەمان بۆ ڕوون بکاتەوە! لەگەڵ ئەوەی ئەمڕۆکەش دەبینین زانستی سەردەم پاش هەوڵ و کۆششێکی زۆر توانیویەتی لەڕێگەی فەرمایشتی خوا پاشان پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ پەی بەرێت بەدۆزینەوەی ئەو ماددەیەی کە مرۆڤی لێ دروست کراوە! بەڵام لەبەر ئەوەی فریشتەکان و پەری لەجیهانی نادیاردان کەمتر پەی پێ دەبەن و چۆکییان شکاوە لەئاست دروست کراوەکانی خوای گەورەدا هەر لەبەر ئەمەیە دەبێت باوەردار زیاتر باوەڕی پتەو بکات کاتێك کەدەبیستێت:

یەکەم: **فریشتە(الملائكة)**: جیهانێکی نادیارن و خوای گەورە لە ڕووناکی (**نور**) دروستی کردوون هیچ تایبەت مەندییەکی پەرستراوییەتییان نی یەبەڵکو خۆیان بەندەن و خواپەرستی دەکەن و نەنێرن نەمێ نەدەخۆن نەدەخۆنەوە، پابەندی تەواویان بەفەرمانەکانی خواوە هەیەو توانای جێبەجێ کردنیان پێ دراوە و چاکەکارن و هەرگیز سەرپێچی ناکەن.

پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەربارەی ئەو مادەیەی کەفریشتەی لێ دروست کراوەدەفەرمووێت:**(خلقت الملائكة من نور......)** واتە: فریشتەکان لەڕووناکی دروست کراون.

**دووەم: پەری(الجن):** کۆمەڵە دروست کراوێکی تری خوای گەورەن خوای گەورە لە بڵێسەی ئاگر(**نار**) دروستی کردون بۆ پەرستنی خۆی، نێرو مێیان هەیە و ئەخۆن و ئەخۆنەوە مرنیشیان بەسەردا دێت، لە دونیادا لە بەرچاوی مرۆڤ دا نادیارن بەویستی خوای گەورەوە توانایەکی باشی پێداون و (شەیطان)یش لەپەرییە، خوای گەورەش لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: **( وَخَلَقَ الْجَانَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ)**[1] واتە: پەرییەکانیشی لە بڵێسەی ئاگر دروست کردووە.

**سێیەم: مرۆڤ(الإنسان):** ئەمیش کۆمەڵە دروست کراوێکی کەی خوای پەروەردگارن لە پوختەیەك لە قوڕ(**طین**) دروستی کردوون، سەرەتا ئادەم (علیەسلام)ی دروست کرد کە باوکی هەموو ئادەمیزادە، لە پاشان لەپشتی ئادەم نەوەکانی دروست کرد، وە هەر لە پەراسوی چەپی ئادەم(علیەسلام) حەوا(علیەسلام) ی دروست کرد کە بەدایکی نەوەی ئادەم ناسراوە مرۆڤ نێرو مێی هەیە دەخۆن و دەخۆنەوەوە مردنیشیان بەسەردێت و دەبنەوە بەو خاکەی کە لەبەشێکی دروست کراون کاری مرۆڤ لەدونیادا پەرستنی خوای گەورەیە بەتەنها، سەبارەت بەدروست کرانی ئادەمیزاد خوای گەورەدە فەرموویێت: **(خَلَقَ الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ)**[2] واتە: ئادەمیزادی دروست کردووە لە قوڕێکی ووشك بوو، وەك فەخفوری.

لێرەدا دەبێت ئینسانی ئاقڵ کەمێك بەخۆی دا بچێتەوە کەوا زانستی نوێ تازە بە تازە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کەوا مرۆڤ لەپوختەیەکی خاك دروست بووە،

---

([1]) - (الرحمن/١٥).

([2]) - (الرحمن/14)

سەبارەت بەم دروست کرانی پەری و مرۆڤ دەگێڕنەوە دەڵێن: جارێك قوتابییەك لەمامۆستایەکی دەپرسێت؟ ئایا مامۆستا ڕاستە خوای گەورە بەئاگر لەدوارۆژدا سزای بەندە یاخی بووەکانی دەدات؟ مامۆستاش لە وەڵامدا دەڵێت: بەڵێ! قوتابییەکە دەیەوێت نەقد بگرێت لەکاری خوا!، پەنا بەخوا دەڵێت ئەی باشە مامۆستا شەیتان لەئاگر دروست نەکراوە؟ مامۆستاش دەڵێت: بەڵی!، قوتابیەکەش دەڵیت: ئەی چۆن ئاگر سزای ئاگر دەدات؟ مامۆستاش نایکاتە نامەردی خڕەقوڕێك لە زەوییەکە هەڵدەگرێت و دەیکێشێ بەسەری قوتابییەکەیدا! قوتابیش دەڵێت: ئاخ خ خ ئەوە بۆ ئەو قوڕەت پیا کێشام چیم کردووە؟ مامۆستای بەڕێزیش دەفەرمووێت: ئەی تۆ بۆ ئازارت پێ گەشت خۆ تۆش لەپوختەیەك لەقوڕ دروست کراوی، ئیتر قوتابیەکە هەستی بە هەڵەی پرسیارەکەی کرد!؟.

## پرسیاری چواردە

**ئەو فریشتە بەڕێزانە (سەلامی خوایان لێ بێت) چی کارێکیان پێ سپێردراوە؟ (ملك الموت – میکائیل – مالك – ئیسرافیل - جبرەئیل - رقیب و عتید)**

### وەڵامی پرسیاری چواردە:

**یەکەم: فریشتەی گیان کێشان (ملك الموت):** کاری ئەم فریشتەیە ئەوەیە هەرکات دروست کراوێکی خوا کاتی تەواو بوو، لەسەر زەوی ئەوا بەویستی خوا گیانی دەکێشێت، خوای گەورە دەفەرمووێت:(قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ)[1] واتە: بەو بێ بڕوایانە بڵێ: فریشتەی گیان کێشان کەکاری گیان کێشانتانی پێ سپێردراوە بەو کارە هەڵدەستێت لەوەو دوا بۆ لای پەروەرگارتان دەگەڕێنەوە.

**دووەم: فریشتەی باران بارین(میکائیل):** کاری ئەم فریشتە بەڕێزەش باراندنی باران و ڕوواندنی ڕووەکە بەویستی خوای گەورە، لە هەرشوینێکی ئاسمان و زەوی خوای گەورە بیەوێت ئەم فریشتەیە بەفەرمانی خوا باران دەبارێنیت و ڕووەك دەڕوێنێت.

**سێیەم: فریشتەی سەرپەرشتیاری سزای دۆزەخ(مالك):** کاری ئەم فریشتە بەڕێزەش سەرپەرشتیاری فریشتەکانی سزا دەری دۆزەخییەکانە لەناو ئاگردا وە خوای گەورە پەردەی داوە بەسەر گوێ یان دا گوێیان لە هاوارو ناڵەی دۆزەخییەکان نییە لەوکاتەی کەسزایان دەدەن!، چونکە دۆزەخییەکان هاواری خوا دەکان تا ئەوان گوێیان لەو هاوارکردنە خوایی یەنەبێت!

[1] - (السجدة/١١)

خواپەنامان بدات، خوای گەورە دەفەرمووێت:(وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ)[1] واتە: دۆزەخی یەکان هاواردەکەن،ئەی مالك دەبا پەروەردگارت بمان کوژێت ،دەبا بمرین و کۆتایی بەم سەغلەتییەمان بێت، لە وەڵامیاندا دەڵێت: بەڕاستی ئەوەجێتانەو بۆ هەمیشەش دەبێت بمێننەوە تییایدا!؟.

**چوارەم: فریشتەی کەڕەنا(ئیسر افیل):** کاری ئەم فریشتە بەڕێزەش فوکردن بەکەڕەنادا(**نفخ الصور**)ە لەفەرمودەیەك دا هاتووە لەوکاتەی میکائیل (**نەفخی صور**)ی پێیە بەچرکە لە ئاست خوای گەورەدا چاو ناتروکێنیت لەبەر ئەوەی هەرکات خوای گەورە فەرمانی پێ کرد دەست بەجێ فووی پییادا بکات کە دوو فوو دەکات فوویەکیان هەرچی خوا ویستی لەسەربێت گیانی دەکێشیت و بوونەوەر تێك دەچێت، وەفوی دووەم خەڵکی هەمو زیندوو دەبنەوە، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت :(وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ)[2] واتە: لەو ڕۆژەدا فوودەکرێت بەکەڕەنادا (مەگەر خوا بزانێت چ دەزگایەکە)! هەرکەس لەئاسمانەکان و زەوی دا مابێت خێرا دەمرێت و، مەگەر کەسێك خوا ویستی لەسەر مردنی نەبێت، لەوەو دوا فوویەکی تری پیادا دەکرێتەوەجا دەست بەجی هەر هەمو خەڵکی هەستاونەتەوە سەرپێ و بەسەرسامییەوە چاوەڕوانن.

---

([1]) - (الزخرف/٧٧)

([2]) - (الزمر/٦٨)

**پێنجەم: فریشتەی نیگا(جبرەئیل):** کاری ئەم فریشتە بەڕێزەش گەیاندنی نیگایە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ سەرجەم پێغەمبەرو نێردراوەکانی وەك خوای گەورەدەفەرمووێت: (وَ إِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ) نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ)[1] واتە: ئەم قورئانە لەلایەن پەروەرگاری هەموو جیهانیانەوە ڕەوانەکراوە، جبرەئیلی ئەمین(فریشتەی نیگا) دایبەزاندووە.

**شەشەم: فریشتەی نوسینی کردەوەکان (رقیب و عتید):** کاری ئەم دوو فریشتە بەڕێزەش نوسینی هەموو کردارو گوفتارێکی بەندەیە بەفەرمانی خوای گەورە وەك دەفەرمووێت:(إِذۡ يَتَلَقَّى ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٞ ) مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ )[2] واتە: کاتێك دوو فریشتە چاودێرەکەی ئادەمیزاد لەلای ڕاست و چەپییەوە دانیشتون، هەموو گوفتارو کردارێکی تۆمار دەکەن بەدەزگای زۆر پێشکەوتوو هەر قسەیەکی لەدەم دەردەچێت خێرا چاودێرێکی ئامادە تۆماری دەکات.

---

([1]) - (الشعراء/192 -١٩٣)
([2]) - (ق-١٧/١٨)

## پرسیاری پانزە

**هەندێك لەو کردەوە چاکانەی کە فریشتەکان(سەلامی خوایان لێ بێت) بەرامبەربە مرۆڤی باوەڕدارئەنجامی دەدەن؟**

## وەڵامی پرسیاری پانزە:

فریشتەو باوەڕدار هاودەنگ و هاو ڕێبازی یەکن چونکە هەردووکیان مل کەچ و گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورەن. جا هەر بەم ڕوانگەیەش فریشتەکان پەیوەندییان بەباوەڕدارانەوە هەیەو مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، لەو هەڵوێستانەی کە فریشتەکان هەیانە بەرامبەر باوەڕداران زۆرن لەوانە (خۆشیان دەوێیت، ڕێگای ڕاستی پیشان دەدەن، داوای لێخۆش بونی بۆ دەکەن لای خوا، ئامادەی کۆڕی زیکرو زانستی دەبن، لەکاتی تەنگانەو جەنگ دا دێن بەهانایەوە پشتیوانی لێ دەکەن و سەری دەخەن، لەگەڵ تەرمەکەیدا ئامادەدەبن، داوی لێخۆشبونی بۆ دەکەن، مژدەو مزگێنی خۆشی پێ دەدەن)

**یەکەم: خۆشیان دەوێت:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: **(إذا أَحَبَّ اللهُ -تعالى- العَبْدَ، نَادَى جِبْرِيلَ: إنَّ اللهَ تعالى يُحِبُّ فلاناً، فَأَحْبِبْهُ، فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، فَيُنَادِي في أَهْلِ السَّمَاءِ: إنَّ اللهَ يحِبُّ فلاناً، فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ القَبُولُ في الأرضِ..)**[1] واتە: ئەگەر خوای گەورەو بێ هاوتا بەندەیەکی خۆش ویست بانگی جوبریل دەکات و پێی دەفەرموویت: ئەوا خوای گەورەفلان کەسی خۆش دەوێت تۆش خۆشت بوێت جبریلیش خۆشی دەوێت، پاشان جبریل بانگی ئاسمانییەکان دەکات و دەفەرمووێت: ئەوا خوای

---

(1) - (رواه البخاري والمسلم)

گەورە فلاّن کەسی خۆش دەوێت ئێوەش خۆشتان بوێت، ئاسمانی یەکانیش کەمەبەست پێی (**فریشتەکان**)ە، خۆشیان دەوێت، ئنجا ڕازی بون و خۆشەویستی ئەو کەسە دەکەوێتە ناو خەڵکی سەرزەویشەوە.

**دووەم: ڕێگای ڕاستی نیشان دەدەن:** پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾دەفەرموێت: **(مَن سأل القضاء وُكِل إلى *نفسه*، ومَن أجبر عليه وكل به ملَكٌ يسدّده)**[1]

واتە: هەرکەس داوای دادوەریەتی بکات دەسپێرێت بەخۆی، وەهەرکەس ناچار بکرێت لەسەری کەبیکات خوای گەورەفریشتەیەکی بۆ دەنێرێت و ڕێگەی ڕاستی نیشان دەدات و هەنگاوەکانی بۆ ڕاست دەکەنەوە.

**سێیەم: داوای لێخۆش بونی بۆ دەکەن لای خوا:** خوای گەورە دەفەرموێت: **(وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِى ٱلْأَرْضِ)**[2] واتە: فریشتەکان بەستایشی پەروەردگاریان پاك و بێگەردی دەردەبڕن و داوای لێخۆس بون بۆ ئەو کەسانەدەکەن کە لەسەر زەوی دان.

هەروەها دەربارەی هەڵگرانی عەرش و ئەوانەی بەدەوری یەوەن دەفەرموێت:

**(ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ) رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ) وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ**

---

[1] - (رواه الترمذي و إبن ماجة)

[2] - (الشورى/٥)

**ٱلۡعَظِيمُ)**[1] واتە: ئەوانەی عەرشیان هەڵگرتووەو هەرچی بەدەوریەوەیە بەستایشی پەروەردگاریان پاکی و بێگەردی بۆ دەردەبڕن و باوەڕی پێ دێنن، وە داوای لێخۆش بوون بۆ ئەوانە دەکەن کەباوەڕیان هێناوەو دەڵێن: پەروەردگارمان بەبەزەیی و زانستی خۆت هەمو شتێکت داگرتووە، جا لەوانەش خۆش ببە کە تەوبەیان کردووەو شوێنی ڕێبازەکەت کەوتوون و لە سزای دۆزەخ بیان پارێزە، پەروەردگارمان بیان خەرە ئەو بەهەشتە ئامادە کراوانەوە کەوا بەڵێنت پێ داون و ئەوانەیش کەوا چاك بون و لەباو باپیران و هاوسەران و وەچەکانیان ،بەراستی هەرتۆی شکۆ مەندووکاربەجێ ی، وە لەناخۆشییەکانی ڕۆژی دوایی بیان پارێزەچونکە هەرکەس لەو ڕۆژەدا لە ناخۆشیەکان بپارێزرێت ئەوا ڕەحمت پێکردوە،وەهەر ئەوەشە بردنەوەو سەرفرازی گەورەو مەزن.

**چوارەم: ئامادەی کۆڕی زیکرو زانستی دەبن:** پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: **(وما اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيوتِ اللَّهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ، ويتَدَارسُونَه بيْنَهُم، إلاَّ نَزَلتْ علَيهِم السَّكِينَة، وغَشِيَتْهُمْ الرَّحْمَة، وَحَفَّتْهُم الملائِكَةُ، وذَكَرهُمُ اللَّه فِيمنْ عِنده )**[2] واتە: هەر کۆمەڵێك لەماڵێك لەماڵەکانی خوای گەورەدا کۆببنەوەو کتێبەکەی خوا بخوێننەوەو لەنێوانی خۆیان دا باسی بکەن، ئارامی و دڵنیيا ی بەسەریان دا دەڕژێت و بەزەیی و ڕەحمەت دایان دەپۆشێت و فریشتەکان چواردەوریان دەدەن و خوای گەورە لای ئەوانەی لە خزمەتی خۆیدان باسیان دەکات.

---

(1) - (غافر/٧-٩)

(2) - (رواه المسلم).

**پێنجەم: لەکاتی تەنگانەو جەنگ دا دێن بەهانایەوە پشتیو انی لێ دەکەن و سەری دەخەن**: هەروەك لەجەنگی (**بدر**)دا بەشداریان کردو مسوڵمانەکانیان سەرخست، خوای گەورەش لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: **(إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ)**[1] واتە: کاتێك داوای فریاکەوتنتان لەپەروەردگارتان دەکرد،ئەویش بەهاناتانەوەهات و فەرمووی: من پشتیوانیتان لێ دەکەم بەهەزار فریشتەی یەك لەدوای یەك و پێشڕەویتان بکەن.

پێغەمبەری خواش ﴿ﷺ﴾ دەیفەرموو: **(هذا جبريلُ، آخِذٌ برأسِ فرَسِه، عليه أداةُ الحربِ)**[2] واتە: ئەوەجبریلەسەری ئەسپەکەی گرتووەو پێویستی شەڕی بەسەرەوەیە.

**شەشەم: درودی بۆ دەنێرن**: خوای گەورەدەفەرمووێت: **(هُوَ ٱلَّذِي يُصَلِّي عَلَيۡكُمۡ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا)**[3] واتە: هەر ئەو زاتە خۆی سەڵاوات و ڕەحمەتی خۆیتان هەمیشەو بەردەوام بەسەردا دەبارێنێت، هەروەها فریشتەکانیشی (داوای لێخۆشبونتان بۆ دەکەن) بۆ ئەوەی لە تاریکستانەکان دەرتان بکات و ڕزگارتان بکات وە بتانخاتە ناو نوورو ڕووناکی (دینداریەوە لە دنیادا، وە بەهەشتی بەرینی لە قیامەتدا، جا ئەو پەروەردگارە) هەمیشەو بەردەوام بۆ ئیمانداران بەڕەحم و میهرەبان و دلۆڤانە.

---

(1) - (الأنفال/٩)
(2) - (رواەالبخاري).
(3) - (الاحزاب/٤٣).

**حەوتەم: مژدەوزگێنی خۆشی پێ دەدەن:** فریشتەکان مژدەیان دا بەپێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) کەخوای گەورە نەوەیەکی ساڵحی پێ دەبەخشێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: **(وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٖ)**[1] واتە: وە مزگێنیان پێ دا بە کوڕێکی دانا (کە ئیسحاق)ە.

هەروەها مژدەیان دا بە بەپێغەمبەر زەکەریا(سەلامی خوای لێبێت) کە یەحیای پێ دەبەخشێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: **(فَنَادَتۡهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٞ يُصَلِّي فِي ٱلۡمِحۡرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحۡيَىٰ مُصَدِّقَۢا بِكَلِمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدٗا وَحَصُورٗا وَنَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ )**[2]

واتە: جا یەکسەر فریشتە جبرئیل بانگی کرد لەکاتێکدا زەکەریا لە میحرابەکەدا وەستا بوو، نوێژی دەکرد، وتی بەڕاستی خوای گەورە مژدەت دەداتێ بە بەخشینی کوڕێک ناوی یەحیایە، بەڕاستدانەری فەرمانی تایبەتی خوایە و گەورە و ڕێزدارە و خۆپارێزە لە گوناهان و پێغەمبەرێکە لە چاکان.

وە ئەم مژدەیە تایبەت نییە بە پێغەمبەران و بەڵکو بۆ باوەڕدارانی تریشە وەك لە فەرموودە ڕاست و دروستەکان دا ئاماژەی پێدراوە.

---

(1) - (الذاريات/٢٨).

(2) - (الذاريات/٢٨).

**هەشتەم: لەگەڵ تەرمەکەیدا ئامادە دەبن:** پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەربارەی سەعدی کوڕی مەعاز(خوای لێ ڕازی بێت) کاتێك وەفاتی کرد فەرمووی: **(هذا الذي تَحَرَّكَ لهُ العرْشُ، وفُتِحَتْ لهُ أبوابُ السماءِ، وشهِدَهُ سبْعونَ ألْفًا من الملائِكةِ ، لقدْ ضُمَّ ضَمَّةً ، ثمَّ فُرِّجَ عنْهُ)**[1] واتە: ئەم هاوەڵە بەڕێزە بوو کە عەرشی خوا بۆی هاتە لەرزەو دەرگاکانی ئاسمانی بۆکرایەوەو حەفتا هەزار فریشتە ئامادەی مردنەکەی بوون، گوشینێك گوشراو پاشان دەروی لێکرایەوە.

(1) - (الراوي : عبدالله بن عمر |المحدث : الألباني |المصدر : صحيح الجامع الصفحة أو الرقم :٦٩٨٧ | خلاصة حكم المحدث : صحيح)

## پرسیاری شانزە

**هەندێك لەوكردەوانەی كەبەهۆی ئەنجام دانیەوە فریشتەی خوا نەفرەت لەخاوەنەكانیان دەكەن؟**

### وەڵامی پرسیاری شانزە:

ئەو كارانەی كەفریشتەكان نەفرەت لەبكەری كارەكە دەكەن زۆرن لەوانە **یەكەم: ئافرەتێك نەچێت بەدەم مێردەكەیەوە:** پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: **(والذي نفسي بيده ما من رجل يدعوا امر أته إلى فراشها فتأبى عليه، إلا كان الذي في السماء ساخطًا عليها حتى يرضى عنها)**[1] واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هەر پیاوێك داوای سەرجێی لە خێزانەكەی بكات خێزانەكەی قەدەغەی بكات و بەدەم داواكەی نەچێت ئەوە خوای گەورەلێی تورەیە هەتا ئەو كاتەی مێردەكەی لێی ڕازی ئەبێت.

لەفەرمودەیەكی تردا ئەفەرموێت هەر پیاوێك داوای سەرجێی لەخێزانەكەی كرد خێزانەكەی بەدەم داواكەیەوە نەچێت و پیاوەكە لێی تورەبێت ئەوا تاكو بەیانی فریشتەكان لەعنەتی لێ ئەكەن.[2]

كەواتە ئافرەتی پەسەند ئەو ئافرەتەیە كەخۆی لەم هەموو هەڕەشانە دەپارێزێت و مێردەكەی ڕازی دەكات هەوڵ ئەدات كەكاری سەرجێی لەگەڵ بكات بۆ ئەوەی توشی تاوان نەبێت. مەگەر ئافرەتەكە عوزری شەرعی هەبێت بەوهۆیە نەتوانێت بچێت بەدەم هاوسەریەوە ئەوكاتە هەڕەشەو نەفرەتەكە نای گرێتەوە.

---

(1) - ( أخرجه مسلم، كتاب النكاح، باب تحريم امتناعها من فراش زوجها، (2/ 1060)، برقم(1436).

(2) - (متفق عليه).

**دووەم: ئەو کەسەی ئاسنێکی تیژ لە برا مسوڵمانەکەی بەرز بکاتەوە:** پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾دەفەرمووێت: **(مَنْ أشارَ إلَى أخيهِ بِحَدِيدَةٍ، فَإنَّ المَلائِكةَ تَلْعنُهُ حتَّى يَنْزِعَ، وإنْ كَانَ أخَاهُ لأبِيهِ وأُمِّهِ)**[1] واتە: هەر کەس ئاسنێك لە برایەکی بەرز بکاتەوە ئەوا فریشتەکانی خوا نەفرەتی لێ دەکەن تا دایدەنێتەوە ئەگەر براکەی لەدایك و باوکیشی بێت).

**سێیەم: ئەو کەسەی جنێو بەهاوەڵێکی پێغەمبەری خوا بدات﴿ﷺ﴾:** پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾دەفەرمووێت:**( من سبّ أصحابي، فَعلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)**[2] واتە: ئەوەی جوێن بدات بەهاوەڵم ،لەسەریەتی نەفرەتی خواو فریشتەکان و خەڵکی بەگشتی.

**چوارەم:ئەوکەسەی ڕێگر بێت لەبەردەم جێ بەجێ کردنی سزای شەرعی خوای دا: ئین عەباس(خوایان لێ رازی بێت) دەڵێت:** پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾فەرموویەتی: **(مَنْ قُتِلَ عمدًا فقَوْدُ يديْه، فمَنْ حالَ بينَهُ و بينَهُ فعليه لعنةُ اللهِ، والملائكةِ، والناسِ أجمعينَ)**[3] واتە: هەرکەسێك کەسێك بکوژێت بەئەنقەست خوێن دەکەوێتە سەری واتە: (دەبێت بکوژرێتەوە لەتۆڵەی ئەو خوێنەدا)، جا هەرکەسێك ڕێگر بێت لەنێوان ئەوکەسەو کوشتنەوەی دا، لەسەریەتی نەفرەتی خواو فریشتەکان و خەڵکی بەگشتی.

---

([1]) - (رواه المسلم).

([2]) - (رواه الطبراني)

([3]) - (الراوي : عبدالله بن عباس |المحدث : الألباني |المصـدر : صحيح الجامع ، الصـفحة أو الرقم: ٦٤٥٠ | خلاصـة حكم المحدث : صحيح ، التخريج : أخرجه أبو داود (٤٥٩١)، والنسائي (٤٧٨٩)، و ابن ماجه (٢٦٣٥) باختلاف يسير .

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە نەفرەتی فریشتەی خوایان لەسەرە ئەوکەسانەن کەداڵدەو پاڵپشتی کەسانی بیدعە چی دەکەن، پالپشتی کەسانێك دەکەن کەوا پشتیوانی لەکەسانێك دەکەن کە شتانێکی زیادەو داهێنراو دەهێننە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەبابەتی بیروباوەڕو پەرستشەکان دا کە نەفەرمانی خوای گەورە نە پێغەمبەری خوای لەسەرە﴿ﷺ﴾.

## پرسیاری حەڤدە

**لەیەکێك لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان داسەبارەت بەڕەو انەکردنی قورئان بۆ پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ بەبەلگەیەکی ڕون و ئاشکرا وەئایەتەکە باسی کتێب و تەرازوو ئاسنی تێدایە! ئەو ئایەتە کامەیە؟ وە لەچی سورەتێك دایە؟**

### وەڵامی پرسیاری حەڤدە:

**سەبارەت بەو ئایەتە پیرۆزە لەسورەتی(الحدید) دایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَ أَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ وَ أَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ)[1].**

واتە: سوێند بەخوا بێگومان ئێمە پێغەمبەرەکانمان ڕەوانەکردووە هاوڕێ لەگەڵ بەڵگەو نیشانەو موعجیزەی ڕوون و ئاشکرا دا و کتێبە ئاسمانیە کانیشمان هێنایە خوارەوە کە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەدا بێت، تەرازوو پێوەری شەرعی و دادپەروەرانەمان بۆ ڕونکردونەتەوە تاخەڵکی بەعەدالەت و دادپەروەری ڕەفتار بکەن، هەروەها ئاسنیشمان دروست کردووە کە ماددەیەکی سەخت و ڕەقەو سوود بەخشیشە بۆ خەڵکی، تا ئەوەی خوا دەیزانێت لەجیهانی واقیعیشدا دەربکەوێت کەکێ پشت گیرو لایەنگیری خواو پێغەمبەرەکانییەتی لەکاتێکدا کەئەو زاتەپەنهانە، چونکە بەڕاستی خوا بەهێزو باڵادەستە.

---

([1]) - (الحدید/٢٥).

## پرسیاری هەژدە

**ناوی ئەو کتێبە ئاسمانیانەی کەباس کراون لەقورئان و سوننەت دا، لەگەڵ ناوی ئەو پێغەمبەرانەی کەبۆیان ڕەوانەکراوە؟**

### وەڵامی پرسیاری هەژدە:

**یەکەم: (الصحف) بۆ (ئیبراهیم) و (موسا) سەلامی خوایان لێ بێت، ڕەوانەکراوە،** وەك خوای گەورەدەفەرمووێت: **(وَٱلۡأَخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ) إِنَّ هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ) صُحُفِ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ)**[1]واتە: دوواڕۆژ باشترو نەبڕاوەترە، ئەمە لە پەیام (صحف)ە پێشوەکانیشدا هاتووە، صحف ی ئیبراهیم و موسا.

تێبینی: زانایانی ئیسلام دەفەرموون: سحوفی ئیبراهیم(علیه السلام) هەمووی پەند بووەو، سحوفی موسا(علیه السلام) یش هەمووی ئامۆژگاری بووە.

**دووەم: (التوراة) بۆ (موسا) سەلامی خوای لێ بێت ڕەوانەکراوە،**وەك خوای گەورە دەفەرمووێت:**(إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞ)**[2]

واتە: ئێمە تەوراتمان ناردۆتە خوارەوە کەڕێنمایی و ڕوناکی تێدا بوو.

**سێیەم: (الزبور) بۆ (داود) سەلامی خوای لێ بێت ڕەوانەکراوە،** وەك خوای گەورە دەفەرمووێت:**(وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا)**[3]

واتە: زەبوریشمان بۆ داود ڕەوانەکرد.

---

([1]) - (الأعلى/17-١٩)

([2]) - (المائدة/٤٤)

([3]) - (الإسراء/٥٥)

چوارەم: (الإنجيل) بۆ (عیسا) سەلامی خوای لێ بێت ڕەوانەکراوە، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت:(وَقَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ فِيهِ هُدٗى وَنُورٞ وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ)[1]واتە: بەشوێن ئەو پێغەمبەرانەدا عیسای کوڕی مەریەممان ڕەوانەکرد کەبڕوای بەو تەوراتە هەبوو لەپێش خۆیەوەڕەوانەکرابوو،وە ئینجیلمان بۆ نارد کەڕێنمایی و ڕوناکی تێدابوو.

پێنجەم: (القرآن) بۆ (محمد)ﷺ ڕەوانەکراوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَقُرۡءَانٗا فَرَقۡنَٰهُ لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكۡثٖ وَنَزَّلۡنَٰهُ تَنزِيلٗا)[2] واتە: قورئانمان بەجیا جیا ناردۆتەخوارەوە بۆ ئەوەی بەهێواشی و لەسەرخۆ بۆخەڵکی بخوێنیتەوەو بەڕەوانەکردن ڕەوانەمان کردووە.

تێبینی: لەپاش دابەزینی قورئان ئەو کتێبانەی تر نەسخ بوونەتەوە! واتە ئێستا بەهیچیان ئیش ناکرێت تەنیا قورئان نەبێت وەلەنێو قورئان دا باسیان لێوەکراوەبەجوانی ئەوانەی ئەمڕۆ کەلەبەردەستا هەن هەموویان دەسکاریان کراوە هەروەك خوای گەورەدەفەرمووێت:(وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ)[3] واتە: جا ئەوەی بێجگە لەئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەرئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لە قیامەتیشدا لە خەسارەت مەندو زەرەر مەندانە.

---

(1) – (المائيدة/٤٦)

(2) - (الإسراء/١٠٦)

(3) -(ال عمران/٨٥)

کەوابو بەهاتنی پێغەمبەری ئیسلام(محمد)﴿ﷺ﴾ و دابەزینی قورئانی پیرۆز کۆتایی هات بە دابەزینی کتێبە ئاسمانی یەکان، ئیتر نە لەدوای پێغەمبەری ئیسلامەوە پێغەمبەرێکی تر دێت، نە پەیامێکی تریش دادەبەزێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی و قورئان کۆتا پەیامی خوای گەورەیەو، وە خوای گەورە خۆی بەڵێنی داوە بەپاراستنی قورئان، بەپێچەوانەوە کتێبەکانی پێشتر دراوەتە دەستی نەتەوەکانی پێشو کە خۆیان پارێزگاری لێ بکەن و بیپارێزن، بەڵام نەك نەیان پاراستوە بەڵکو پاش پێغەمبەرەکانیشیان دەستکاریان کردووەو شێواندویانە، وە بەڵام قورئان تا ئەو ڕۆژەی لەسەر زەوی بمێنێت خوای گەورە خۆی پارێزگاری لێ دەکات و هیچ کەسێکیش ناتوانێت دەستکاری بکات و بیشێوێنێت ئەگەرچی زۆر هەوڵیش دراوە لەلایەن ناحەزانی ئیسلامەوە بەڵام هەموویان بەو داخەوە سەریان ناوەتەوە لەکۆن و نوێش دا، ئەوان لە ناودەچن و قورئانیش تابێت شوێن کەوتوانی زیاترو زۆرتر دەبن.

## پرسیاری نۆزدە

**لەقورئانی پیرۆزدا چەند جۆرێك ئیعجازباس كراون، لێرەدا باسی سێ نمونە دەكەین!**

### وەڵامی پرسیاری نۆزدە:

**نموونەی یەكەم: دەربارەی ئیعجازی مێژوویی:**

عبداللهی كوڕی مەسعود(خوا لێی ڕازیبێت)دەفەرمووێت: فارسەكان بەسەر ڕۆمەكان دا سەركەوتبوون، موشریكەكانی قورەیش پێیان خۆش بوو، بەڵام باوەڕ داران حەزیان دەكرد ڕۆمەكان سەركەون بەسەر فارسەكان دا، چونكە خاوەنی پەیامی ئاسمانی بوون و لەئاینەكەیانەوە نزیكتربوون، ئنجا ئەم ئایەتە دابەزی كە دەفەرمووێت: (الٓمٓ ) غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ) فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ)[1] واتە: الف – لام - میم، ڕۆمەكان لەنزیكترین یاخود نزمترین شوێنی زەویدا تێك شكان و ئەوان دوای تێكشكانەكەیان هەر سەردەكەون.

**هاوبەش دانەران ووتیان** : ئەی ئەبوبەكر هاوەڵەكەت دەڵێ: لەماوەی چەند ساڵێك دا ڕۆمەكان بەسەرفارسەكان دا سەردەكەون؟ فەرمووی: ڕاست دەكات! ووتیان : ئەی بۆگرەو نەكەین؟ بەڵێنیان پێ دا لەسەر چوار ووشتری گەنج، هەتا ماوەی حەوت ساڵ، حەوت ساڵەكە تێ پەڕی وهیچ نەبوو!هاوبەش دانەران بەوە دڵخۆش بوون، بەلای مسوڵمانەكانیشەوە گران و ناخۆش بوو، ئیمامی ئەبوبەكر(خوای لێ ڕازیبێت) ئەم بەسەر هاتەی بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) باس كرد،

---

([1]) - (الروم/١/٣)

ئەویش فەرمووی:- **(مابضع سنين عندكم)؟** واتە: چەند(**بضع**) ساڵێك لای ئێوە چەندەیە؟ ووتیان: لەدەکەمترە، فەرمووی:- **(إذهب فزايدهم وأزدد سنتين في الأجل)** واتە: برِۆ پێیان زیاد بکەو دووساڵ بخەرەسەرماوەکە، إبن مەسعود (خوای لێ ڕازیبێت) دەفەرموویت: دووساڵەکە تێنەپەڕی بوو سوارە هات و هەواڵی سەرکەوتنی ڕۆمەکانی بەسەر فارسەکان دا ڕاگەیاند باوەڕداران بەم هەواڵەزۆر دڵخۆش بوون، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە:

**(الٓمٓ ) غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ) فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ) فِي بِضۡعِ سِنِينَ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ) بِنَصۡرِ ٱللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ) وَعۡدَ ٱللَّهِ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ)**[1]

واتە:ئەلف – لام – میم، ڕۆمەکان لەنزیکترین یاخود نزمترین شوێنی زەویدا تێك شکان و ئەوان دوای تێکشکانەکەیان هەر سەردەکەون، لەماوەی چەند ساڵێکی تردا، فەرمان هەر بۆ خوای گەورەیە لەوەو پێش و لەوەو دواش، ئەو ڕۆژە باوەڕداران بەسەرکەوتنی خوا دڵخۆش دەبن و خوا بیەوێت هەرکەس سەر بخات سەری دەخات و هەر خۆی شکۆمەندو میهرەبانە، خوا بەڵێنی داوەو بەڵێنی خواش دواناکەوێت، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.[2]

---

([1]) - (الروم/١/٦)

([2]) - (اخرجه ابن جريرو ابن ابي حاتم والترمذي).

**نموونەی دووەم: دەربارەی ئیعجازی ڕەوان بێژی:**

خوای گەورە بۆ ئەوەی توندی و سەختی سزای دۆزەخ دەربخات بۆبێ باوەران، بەڵام بەپیشان دانی کەمترین ڕێژەی ئەوسزایە کەبەو کەمیەش چەندە کاریگەرە، ئەم مەبەستە لەچەند وشەیەکی قورئانداو بەشێوەیەکی (**معجز**) دەردەبڕێت، دەفەرموویت: **( وَلَئِن مَّسَّتۡهُمۡ نَفۡحَةٞ مِّنۡ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ)**[1] واتە: ئەگەر هەواڵێك لەسزای پەروەردگارتان بەربکەوێت دەڵێن: داماوو سەرگەردان خۆین بەڕاستی ئێمەستەم کار بووین. لێرەدا دەبینین هەمو پێك هاتی ڕستەکە هاوئاهەنگن و سەرجەم واتای کەمێتی دەگەیەنن چونکە:

1. ووشەی(**لئن**) واتە: ئەگەر بۆ گومان پەیدا کردنەو واتای کەمی دەگەیەنێت.
2. ووشەی(**مس**) واتە: بەرکەوتنێکی کەم، واتای کەمی چەشتنی ئاگرەکە دەگەیەنێت.
3. ووشەی(**نفحة**) واتە: هەڵاوێك، لەسێ ڕووەوە واتای کەمێتی دەبەخشێت:

أ. هەڵاو کەمترین ڕێژەی ئاگرە.

ب.(**نفحة**)چاوگی(**مرة**) یەو واتای یەکجار دەگەیەنێت.

ج.(**نفحة**)کە تەنوینی نەناسراوی لەسەرە، واتە: هێندە کەمە گوێی پێنادرێت.

4. ووشەی(**مِّنۡ**) بۆ(**هەند**)ە، واتە: بەشێك و لەچاو هەموو دا کەمی دەبەخشێت.

---

([1]) - (الانبیاء/٤٦)

5.ووشەی (**عذاب**) واتە: سزا، جۆرێکی هێواشی سزایە بە بەراورد لەگەڵ جۆرەکانی تری وەك(**نكال**) و (**عقاب**).

6. ووشەی (**ربك**) واتە: پەروەردگارت، یەکێکە لەو ناوانەی کە واتای بەزەیی و بەخشندەیی دەگەیەنن، بەبەراورد لەگەڵ ناوی(**القهار**)و(**المنتقم**)، ئەمیش میهرەبانی سزادەرەکە دەگەیەنێت، واتە: ئەگەر سزایەکی ئەوەندەکەم بەو جۆرە بەسوێ و ئازاربێت و بێ باوەڕان بخاتەهاوار و لاڵانەوەو لەتاویدا دان بەستەم کاری خۆیاندا بنێن، ئەی دەبێت سزای سەخت و توندی بەقین و ڕقی خوای تۆڵەسێن و شکۆمەند چەندە بە ئازاربێت و چیان لێ بکات؟

**نموونەی سێیەم: دەربارەی ئیعجازی زانستی:**

دروستکردن سیفەتێکی تایبەتە بەخوای گەورە و کەسی تر ناتوانێت خۆی لەو پەرێزە بدات چونکەخۆی دروستکراوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموویت: ( وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ خَلْقًا كَخَلْقِي ؟ فَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً، أَوْ لِيَخْلُقُوا حَبَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا شَعِيرَةً)[1] واتە: خوای گەورە دەفەرموویت: کێ ستەمکارترە لەو کەسەی دێت و لەشێوەی دروستکراوەکانی من دروست دەکات، با (**مێرولە**) یان (**گەردیلە**) یەك دروست بکەن, یان دەنکە تۆوێك دروست بکەن، یاخوود دەنکە جۆیەك دروست بکەن.

خوای گەورە لەباسی سەرەتای دروستکردنی مرۆڤ و قۆناغەکانی پێکهاتنی کۆرپەلەدا دەفەرموێت: (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ * ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ * ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً

---

(1) - (متفق عليه)

**(فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ)**[1]

واتە: مرۆڤمان لە پوختەیەکی وەرگیراو لە قوڕ دروستکردوە، پاشان کردوومانە بە تنۆکە ئاوێك لەشوێنێکی جێگیردا کە (ڕەحمە)، ئنجا لەتنۆکە ئاوەکە خوێن پارەیەکمان دروستکردوە، لەخوێن پارەکەش گۆشت پارەیەکمان دروست کردوە (بەئەندازەی پاروویەکی جوراو) لە گۆشتپارەکەش ئێسقانمان دروستکردوە، واتە (پەیکەی ئێسك) ئێسقانەکەشمان بە گۆشت داپۆشیوە، ئینجا دروستکراوێکی ترمان لێ پێکهێناوە، پاك و پیرۆزی بۆ خوا کە چاکترینی دروستکارانە .

ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین هەریەك لەو برگانەی لەم چەند ئایەتە پیرۆزەدا هاتوون ڕاستییەکی زانستی دەردەبڕن و گەورەترین ئیعجازی زانستی دەسەلمێنن، وەك لێرەدا زۆر بەکورتی ئاماژەیان بۆ دەکەین .

**یەکەم:خوای گەورەدەفەرموێت (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ)**

واتە: مرۆڤمان لەپوختەیەکی وەرگیراو لەقوڕ دروستکردوە .

ئەگەر مرۆڤ بگێڕینەوە بۆ ڕەگەزە سەرەتاییەکانی پێکهاتنی لەشی دەبینین (بیست و دوو) ڕەگەز بەشداری لە پێکهاتنی دادەکەن و وە بەم شێوەیەدابەش دەبن:

**أ) (ئۆکسجین )+(هایدرۆجین)**بە شێوەی ئاو ، بەڕێژەی (٦٠-٦٥%) لەسەدا، لەکێشی لەش.

---

[1] - (سورة المؤمنون (١٢/١٤)

**ب) (کاربۆن)+(هایدرۆجین)+(ئۆکسجین)** بنچینەی پێکهاتنە ئەندامییەکان پێکدێنن لە :**(شەکرەمەنی)و(پرۆتینات)و(ڤیتامینات)و(هۆرمۆنات).**

**ج) ماددەوشکەکان** : کە بەم شێوەیە دابەش دەبن:

* حەوتیان بریتین لە **(کلۆر، کبریت، فۆسفۆر، مەگنیسیۆم، کلس، پۆتاسیۆم، سۆدیۆم) کەڕێژەی (٨٠-٦٠%)** ی لەسەدای ماددەوشکەکان پێکدێنن .

* حەوتی تریان بریتین لە: ( **ئاسن، مس، یۆد، مەنگەنیز، کۆباڵت، تۆتیا، مۆلبیدیۆم)** ئەمان بەڕێژەیەکی کەمتر .

* شەشیان بەڕێژەیەکی زۆر کەم کەبریتین لە: **(فلۆر، ئەلەمنیۆم، بۆر، سیلینیۆم، کادمیۆم، کرۆم) .**

هەر یەك لەو ڕەگەزانە لەخاکی زەویدا هەن و مەرج نییە هەموو پێکهاتەکانی خاك لە پێکهاتەکانی لەشی مرۆڤدا هەبن چونکە زیاتر لە(١٠٠) ڕەگەز لە زەویدا هەن بەڵام تا ئێستا تەنها (**بیست و دوویان** )دۆزراوەتەوە کە بەشداری لە پێکهاتەی لەشی مرۆڤدا دەکەن .

خوای گەورەش بۆیەدەفەرموێت **:(مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ)** واتە: لە پوختەیەکی وەرگیراو لەقوڕ.

هەروەها پێکهێنەری بنچینەی لەش ئاوەکە ڕێژەی **(٤/٣)** دەبێت و مرۆڤ ناتوانێت لە چوار ڕۆژ زیاتر بەبێ ئاو بژی مەگەر حاڵەتێکی شاز بێت کەخوا خۆی بیەوێت ئەو کەسە بژی.

خوای گەورە دەفەرمووێت **:(وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ)** واتە: لەئاو هەموو شتێکی زیندوومان دروستکردوە.

**دووەم: خوای گەورەدەفەرموویت :(ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً ...)** واتە: پاشان کردوومانە بە تنۆکە ئاویك ...

**(نُطْفَةً)** لە زمانی عەرەبیدا ناوە بۆ تۆوی پیاو، هەر چەندە لێرەدا مەبەست لە تۆوێکی پیتێنراوەلە: **(تۆو + هێلکۆکەی ئافرەت)**، بەڵام خوای گەورە قۆناغەکەی بە [**نُطفَةً**] ناو بردووە، چونکە کۆرپەلە **(بەنێرو مێیەوە)** تۆوی پیاوەکە کە لەدیاریکردنی ڕەگەزەکەی بەر پرسیارە، لەبەر ئەوەی [**صبغیات**]ی جنسی جیاواز هەڵدەگرێت، بەپێچەوانەی هێلکۆکەی ئافرەتەکە وەکە[صبغیات]ی جنسی هاوشێوە هەڵدەگرێت، بەم شێوەیە کرداری پیتێنەکە ڕوودەدات: پیاوەکە[**نُطفَةً**]ی **(xy)** هەیە، بەڵام ئافرەتەکە هێلکۆکەی **(xx)**ی هەیەو بەم شێوەیەکۆرپەلەیان لێ پێکدێت .

تۆوی**(y)** + هێلکۆکەی **(x)** = **(xy)** نێرینە.

تۆوی**(x)** + هێلکۆکەی **(x)** = **(xx)** مێینە.

**سێیەم: خوای گەورە دەفەرموویت :- (فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ )** واتە: لە شوێنێکی جێگیردا .

مەبەست لە تۆوە تێکەڵ و پیتێنراوەکەیە کە لە(**ڕەحم**)دا جێگیر دەبێت و بەهۆی دەستەبەربوونی سێ هۆکارەوە پارێزراوە :

**١. لەڕووی توێژینەوەوە:**

أ) ڕەحم دەکەوێتە حەوزێکەوە .

ب) ئەو حەوزە لەدیوارێکی ئێسقانی پێکهاتووە.

ت) ڕەحم چەندەها پشتێنەی تێدایە کە لەبەشی جیاجیاوە شۆڕ دەبنەوەو دەیبەستنەوە بە دیواری سکەوە یان بە ئێسقانەکانی حەوزەوە .

**٢. لەڕووی هۆرمۆنەوە :**

ڕەحم بەردەوام دێتەوە یەك و گرژ دەبێت و دەجولێت، ئەگەر لەکاتێکدا کۆرپەلەی تێدایە هەر بەو شێوەیە لە گرژبوونەوەو خاوبوونەوەدا بێت ئەوا دەیخاتە مەترسییەوە بەمراندنی یاخود لەباربردنی، بەڵام خوای گەورە مشوری خواردوە، چونکە کاتێك تۆوەکە دەچێتە ڕەحمەوە ڕێژەی ڕژانی هۆرمۆنی (البروجسترون) بەرزدەبێتەوە بەو هۆرمۆنەوە ڕەحم لە گرژبوون و خاوبوونەوە دەکەوێت و جووڵەی کەم دەبێت .

**٣. لەڕووی میکانیکییەوە :**

دووای مانگی سێیەم ڕەحم بەشێوەیەکی بەرچاو دەست دەکات بە بەرزبوونەوە بەرەو سك و لەژێر پارێزگاری ئێسقانەی حەوز دەردەچێت، بەڵام لەبری ئەوە خوای گەورە شلەی (الأمنيوسي)تێدا زیاد دەکات و لە هەموو لایەکەوە دەورەی کۆرپەلە دەدات و لەپێکدادانی دەرەکی دەیپارێزێت .

**چوارەم: خوای گەورەدە فەرموێت :(ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً )**واتە: پاشان لەتنۆکە ئاوەکە خوێن پارەیەك دروست دەکەین .

(**علق**) لە زمانی عەرەبیدا بە(**زەروو**) دەوترێت، لە هەمان کاتیشدا بە واتای هەڵواسین دەگەیەنێت، ئیجا کۆرپەلەش لەم قۆناغەیدا هەم لە (زەروو) دەچێت و هەم خۆی بە دیواری ڕەحمدا هەڵدەواسێت .

**پێنجەم: خوای گەورە دەفەرمووێت :(فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً)** واتە: لە خوێن پارەکە گۆشت پارەیەك دروست دەکەین .

(**مضغة**) به پارچه گۆشتێك دەوترێت پارویەك ببێت، چونکه کۆرپەله لەم قۆناغەیدا گۆشتپارەیەو لەهەمان کاتدا لەپاروی جوراو دەچێت و گرنج گرنجە .

**ئەم قۆناغە دوو حاڵەتی هەیە:**

**یەکەمیان:** پێی دەوترێت (مضغة غيرمخلقة) کە هێشتا گۆشتپارەکە هیچ شێوەیەکی لێ دروست نەکراوە.

**دووەمیان:** پێی دەوترێت (مضغة مخلقة) کەلەم حاڵەتەدا گۆشتپارەکە سەرجەم ئەندامەکان و شێوەی تەواوی مرۆڤی لێ دروست دەکرێت .

**شەشەم: خوای گەورەدەفەرموێت:** (فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا) واتە: لە گۆشتپارەکە ئێسقانێك دروستدەکەین و ئێسقانەکەش بەگۆشت دادەپۆشین .

لەم قۆناغەدا پەیکەری ئێسکی کۆرپەلە بەتەواوی لەگۆشت پارەکە دروست دە بێت و ماسولکەو گۆشت دەورەی دەدەن پێوەی دەلکێن.

**حەوتەم: خوای گەورەدەفەرمووێت:** (ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ) واتە: ئنجا دروستکراوێکی تری لێپێکدەهێنین .

هەتا ئێستا کۆرپەلە لەقۆناغی درووستبووندابووە هیچ جووڵەو گەشەیەکی زیندەگیانەی نەبووە، بەڵام لەسەرەتای ئەم قۆناغەوە کە لەکۆتایی مانگی سێیەم و سەرەتای مانگی چوارەمەوەیە کۆئەندامی لاشەی بەتەواوی دروست دەبن و دەست دەکەن بەفەرمانی خۆیان و بەشێوەیەکی خێرا کێشی کۆرپەلە زیاد دەکات و لەسەرەتای مانگی چوارەمەوە ئەندامی مێشك دەبەسترێتەوە

بەسەرجەم کۆئەندامەکانی ترەوە، تێکڕایان جووڵەو کاری خۆیان دەست پێدەکەن و بەشێوەیەکی بەرچاو گەشەدەکەن.
لەدوای دەرکەوتنی ئەم تووێژینەوە (**کیث - ل - مور**) کە پرۆفیسۆری زانستی تووێژینەوەو کۆرپەلە ناسییە لە زانکۆی (**تۆرنتۆی**)کەنەداو خاوەنی کتێبی (قۆناغەکانی درووستبوونی مرۆڤ) (the developing human)
کاتێك لەکۆنگرەی نوشداری هەشتەمی وڵاتی حەرەمەیندا بەشداری کردوو ئەو بەڵگانەی بۆ خوێنرایەوە کەلە(قورئان و سوننەت)دا ها توون، بەتایبەتی ئەو ئایەتەی کە لێرەدا باسمانکرد وتی: بۆم دەرکەوتووە کە ئەم بەڵگانە حەتمەن لەلایەن خواوە بۆ (محمد) ﴿ﷺ﴾ هاتوون، ئەمەش دەیسەلمێنێت کە (محمد) ﴿ﷺ﴾ نێردراوی خوایە.
لە کۆتاییدا ئێمەش دەڵێین پاکی و بێگەردی بۆ خوای جیهانیان هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: **(فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ)** واتە: پاك وپیرۆزی بۆ خوا کەچاکترینی دروستکارانە.
هەڵبەت لەقورئانی پیرۆزدا زۆر نموونە هەیە کەباسیان لێوەبکرێت بەڵام مرۆڤی ئاقڵ تەنیا نموونەیەك بەسە بۆ پتەوی بیرو باوەڕەکەی!!!؟.

## *پرسیاری بیست*

**پێناسەی نێردراو(الرسول) چییە؟ وە پێناسەی هەڵبژێردراو (النبي)چییە؟ وە جیاوازی چییە لە نێوان(الرسول) و (النبي)دا؟ وە ئایا دەتوانرێت بە هەموو (الرسول)ێك بووترێت (النبي)؟ یان بەپێچەوانەوە؟**

### وەڵامی پرسیاری بیست:

**نێردراو (الرسول)**واتە: ئەو کەسەیە کەخوای گەورە سروشی **(وەحی)** بۆ دەکات و پەیام و شەریعەتی بۆ دەنێرێت و فەرمانی پێ دەکات بەخەڵکی ڕابگەیەنێت.

**هەڵبژێردراو(النبي)**واتە: ئەو کەسەیە کە خوای گەورە سروشی**(وەحی)** بۆ دەکات وپەیام و شەریعەتی بۆ دەنێرێت، بەلام فەرمانی پێناکات بە خەلکی ڕابگەیەنێت بەڵکو لەسەر ڕەویەی پێغەمبەرەکەی پێشوی دەڕاوت و لەناو خەڵکیدا پیادەی دەکات.

کەوابو لێرەدا دەتوانین بڵێین بەڵێ هەموو نێرردراوێك هەڵبژێردراوە، بەڵام هەموو هەڵبژێردراوێك نێردراو نییە، چونکە هەڵبژێردراو دەبێت بەردەوام بێت لەسەر پەیامی نێردراوەکەی پێش خۆی.

## *رسیاری بیست و یەك

**ژمارەی ناوەکانی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾چەندن؟ وەپێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ چەند جۆر موعجیزەی هەبووە؟**

### وەڵامی پرسیاری بیست و یەك:

پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ناوی زۆرە، هەندێ لەزانا گەیاندوویەتی هەتا (٣٠٠) ناو، هەندێ لەو ناوانەشی کەلەقورئاندا هاتوون، ئەمانەن:

(الشاهد - شایەتدەر)(المبشر- مژدەدەر)(النذير - ترسێنەر)(المبين - دیار)

(الداعي - بانگێشکەر بۆلای خوا)( السراج المنير - چرای درەوشاو)

(المذكر - بیرخەرەوە)(الرحمة-بەزەیی)(النعمة - نیعمەت)(الهادي - ڕێنمویکەر)

(الأمين - دەستپاک...هتد).

ئەوەش کە لەقورئان و سوننەتدا هاتووە، بریتییە لە( ئەحمەد و موحەممەد).

ئەوەش کە لەسوننەتدا هاتووە، وەک: (الماحي - سڕەوە)(الحاشر - بەهاتنی ئەو حەشر نزیك بۆوە)( العاقب - دوابەدوای پێغەمبەران هاتووە) (المقفي- شوێن پەیڕەوی پێغەمبەرانی پێش خۆی کەوتووە(ڕێگەی یەکخواپەرستی)(نبي الرحمة -پێغەمبەری بەزەیی و خێروفەڕ)(نبي التوبة - خوای گەورەدەرگای تەوبەی پێوەکردۆتەوە)(المتوكل-پشت بەستوو بەخوای خۆی هەمیشە ...هتد).

لەناوە بەناوبانگەکانیشی: (المختار-هەڵبژێرراو) (المصطفى-پوختەکراو) (الشفيع - داواکەری شەفاعەت) (المشفع- شەفاعەتی وەردەگیرێت) (الصادق–ڕاستگۆ) ( المصدوق - بڕواپێکراو..).

هەروەها لەتەوراتدا ناوی هاتووە بە( الضحاك القتال) هەروەک (ئیبن عەبباس) خوای لێ ڕازی بێت باسی دەکات، ئیبن تەیمییە و ئیبن قەییم و ئیبن ئەثیریش ڕەحمەتی خوایان لێبێت باسیان لێوەکردووە.

ئەم دوو ناوەش لێک جیاناکرێنەوەو دوو ناوی پێچەوانەن بەڵام هەریەکەیان بۆ مەبەستێک، (**الضحاك**) بەمانای ڕووخۆش و دەم بەپێکەنین کە بۆ مسوڵمانانە، (**القتال**)یش واتە: کوژەرو پشتشکێنی دوژمنانی خوایە، هەندێك لەمێژوونوسانی ئیسلام دەڵێن: پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾زیاتر بەم پێنج ناوەی دا دەناسرێتەوە وەك لەفەرموودەیەکی صەحیحدادەفەرمووێت: **(أنا محمدُ، و أنا أحمدُ ، و أنا الماحي الذي يمحو الله بي الكفرَ، و أنا الحاشرُ الذي يُحشَرُ الناسُ على قَدَمي ، و أنا العاقبُ ، والعاقبُ الذي ليس بعده نبيٌّ)**[1]

واتە: من موحەمەدم و، من ئەحمەدم و،من(الماحی)م کەوا بێباوەڕیم پێ دەکوژێتەوەو،من(الحاشر)م کەخەڵکی بەشوێنمدا حەشر دەکرێن وە من (العاقب)م (العاقب)یش ئەو پێغەمبەرەیە کە هیچ پێغەمبەری تری بەدوادا نایەت.

وە (ئەبو موسای ئەشعەری)(رەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە لەپێغەمبەری خواوە﴿ﷺ﴾ کەفەرموویەتی:**( كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَمِّي لَنَا نَفْسَهُ أَسْمَاءً فَقَالَ : أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَحْمَدُ، وَالْمُقَفِّي، وَالْحَاشِرُ، وَنَبِيُّ التَّوْبَةِ، وَنَبِيُّ الرَّحْمَةِ)**[2]

---

(1) - (الراوي : جبيربن مطعم | المحدث : الألباني | المصدر : مختصر الشمائل، الصفحة أو الرقم: ٣١٥ | خلاصة حكم المحدث : صحيح | انظر شرح الحديث رقم (٦٣١٩٨).

(2) - (رواه مسلم - ٢٣٥٥).

واتە: پێغەمبەری خوا ناوی خۆی ئەبرد و ئەیوت من محمدم، وحمدم، ومقفیم، و حاشرمەو، پێغەمبەری تەوبەمەو، پێغەمبەری بەزەیم.

**موعجیزەکانی** : پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دووجۆر موعجیزەی هەیە:

**یەکەم: موعجیزە بەرهەستەکان:** مەبەست لەو ڕووداوانەیەکە لە ڕێسای ژیان بەدەرن و لەسەر دەستی دا ڕوویان داوەو بەڵگەی کاتی بوون، وەك: لەت بونی مانگ و، سڵاو لێکردنی بەردو، هاتنە دەرەوەی ئاو لەنێو پەنجە کانیەوەو،گریە و ناڵەی قەدی دارخورماو، تێرکردنی خەڵکێکی زۆر لە خواردنێکی کەم تا......زۆرێکی تر لەوموعجیزە بەرهەستانەی کە لەفەرموودە صەحیحەکان دا هاتوون.

**دووەم: موعجیزەی زانستیانە:** مەبەست لەموعجیزەیە کەبەردەوام زانستی تێدا بەدی بکرێت و ژیری بیسەلمێنێت کەزادەی بیرو توانای مرۆڤ نییە و کەسی تر نەتوانێت پیی هەڵسێت، ئنجا بەو پێیەی کە پێغەمبەری ئیسلام محمد﴿ﷺ﴾ دوایین پێغەمبەرەو پەیامەکەی بۆ تێکڕای مرۆڤایەتییە تا ڕۆژی دوایی، خوای گەورە موعجیزەیەکی زانستیانەی بەردەوامی وای پێداوە کە لەگەڵ ڕادەی پێگەشتنی بیرو ئاوەزی خەڵکیدا بگونجێت و هەر لە سەرەتای پێغەمبەرایەتییەوە بەربەرەکانێی(تحدی)ی خەڵکی کردووەو بەردەوامیش دەیکات هەتا مرۆڤ لەسەر زەوی بژی و ژیانی دنیای بمێنێت ئەویش(**قورئان**) خوای گەورە دەفەرموویت: (وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ) فَإِن لَّمْ

**تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ)[1]**

واتە: ئەگەر ئێوە لەگوماندان بەرامبەر بەڕاستییەتی ئەو قورئانەی ناردوما نە بۆ بەندەکەمان کەمەبەست(پێغەمبەری خوایە)﴿ﷺ﴾ ئەوا یەك سورەت بە وێنەی بێنن و بۆ ئەم مەبەستە هەموو شایەت و پشتیوانەکانتان بێجگە لەخوا بانگ بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن، ئنجا ئەگەر نەتانکردو ناشی کەن، ئەوا لە ئاگرێك بترسن کە سوتەمەنییەکەی خەڵك و بەردە کە بۆ بێباوەران ئامادەکراوە.

هەروەها پێغەمبەری خواش﴿ﷺ﴾ دەفەرموویت: **(ما مِنَ الأنْبِياءِ نَبِيٌّ إلَّا أُعْطِيَ ما مِثْلُهُ آمَنَ عليه البَشَرُ، و إنَّما كانَ الذي أُوتِيتُ وحْيًا أوْحاهُ اللَّهُ إلَيَّ، فأرْجُو أنْ أكُونَ أكْثَرَهُمْ تابِعًا يَومَ القِيامَةِ).[2]**

واتە: هەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران موعجیزەیەکی بەوێنەی ئەو موعجیزانە پێ دراوە کە خەڵکی باوەریان پێ هێناوە بەڵام ئەو موعجیزەیەی کە بەمن دراوە سروشەو خوا نیگای کردووە بۆم، تکام وایە لە ڕۆژی دواییدا زۆرترین شوێن کەوتوم هەبێت.

---

(1) - (البقرة/٢٣/٢٤)

(2) - (الراوي : أبو هريرة |المحدث : البخاري |المصدر : صحيح البخاري ، الصفحة أو الرقم :٤٩٨١ | خلاصة حكم المحدث] : صحيح ]
التخريج : أخرجه البخاري (٤٩٨١) واللفظ له، ومسلم (١٥٢)

## پرسیاری بیست و دوو

**نیشانەکانی رۆژی دو ایی دەکرێت بەچەند بەشەوە؟**

### وەڵامی پرسیاری بیست و دوو:

**نیشانەکانی ڕۆژی دو ایی دەکرێت بەدوو بەشەوە:**

**یەکەم: نیشانە بچووکەکانی قیامەت:** زانایان ڕەحمەتی خوایان لێبێت نیشانە بچووکەکانیان کردووە بەدوو بەشەوە کەبریتین لە:

**١. ئەو نیشانانەی کەپێشتر هاتونەتەدی و ڕوویان داوەو تێپەڕیوون،** کە زانایان شوێنی ڕووداوەکانیان دیاری کردووە، وەك: (وەفاتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾، شەهید کردنی عومەری کوڕی خەطاب، شەهیدکردنی عوسمانی کوڕی عفان، جەنگی (جمل) لەنێوان لەشکری ئیمامی علی و لەشکری عائیشەی دایکی ئیمانداران، جەنگی (صفین) لە نێوان ئیمامی علی و معاوی یەدا، سەرهەڵدانی فیتنەی خەواریج وجەنگی(نهروان)، دابەزینی ئیمامی حسن لە خەلیفایەتی بۆ معاویە، گەشتنی ئیسلام بەخۆر هەڵات و خۆرئاوا، گرکانێك لەحیجاز ڕوودەدات، شەڕکردن لەگەڵ تورك دا، سەر هەڵدانی نزیکەی (٣٠) درۆزن کە لافی پێغەمبەرایەتی لێدەدەن ، فیتنەی هەرەج و کوشتاری نێو خۆی مسوڵمانان، دروست بونی(٧٣) کۆمەڵ و شوێن پێ هەڵگرتنی گەلانی ڕابردوو، فیتنەکان لە خۆرهەڵاتەوە سەرهەڵ دەدەن).

**٢. ئەونیشانانەی کە بەنیشانەکانی ناوەڕاست یان نیشانەناوەندییەکان دەژمێردرێن،** کە ئەو نیشانانە دەگرێتەوە کە هەتا ئەمڕۆ بەبەردەوامی لەبەر چاو بەرجەستەن ودەبینرێن، وە ئەگەر نەشڵێین هەموویان ئەوا بەشی هەرە زۆریان هاتونەتەدی، وەك:

(نەمانی دەست پاکی و ئەمانەت، کەسانی بێ نرخ کاروباری مسوڵمانان دەگرنە دەست، کەم بوونی زانست و زۆربوونی نەزانین، زۆربوونی پۆلیس و دەست و پێوەندی ستەم کاران، پەیدابوونی ئافرەتی ڕوت و زۆربوونی زینا کردن، خواردنەوەی مەی بەئاشکراو بەحەڵاڵ زانینی، زۆربوونی ئامێری مۆسیقا و گۆرانی بێژان، زۆربوون و بڵاوبوونەوەی سوو خۆری وکەم بوونەوەی پارەی حەڵاڵ، گرنگی دان بەڕازاندنەوەی مزگەوتەکان بەدیکۆر، زۆربوونی کوشت و کوشتار، بەرزکردنەوەی بیناو خانوبەرە، لێك نزیك بوونەوەی کات و لێك نزیك بونەوەی بازاڕەکان، وە چەندینی تر کەبەردەوامن لە ڕوودان هەندێکیشیان ماون ڕوبدەن وەك دەرکەوتنی چیایەکی ئاڵتون لەڕوباری فورات و هاتنی ئیمامی مەهدی(علیه السلام)....).

**دووەم: نیشانەگەورەکانی قیامەت:** عبداللهی کوڕی عمر(خوای لێ ڕازیبێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە﴿ﷺ﴾ کەفەرموویەتی: **(الآيات خرزات منظومات في سلك يتبع بعضها بعضاً)**[1] واتە: نیشانەکان وەك مورووی هۆنراوەوان لەسەر پەتێك، هەر لەگەڵ پەتەکە بچڕا یەك بەدووای یەکدا دەخزێن و دەکەونە خوار.

لێرەدا زانایان دەفەرموون کە نیشانە گەورەکانی قیامەت لەماوەیەکی کورت دا یەك بەدوای یەك دێن و وەکە دەستی پێکرد وەستانی نییە تا کەوتنە خوارەوەی دووا موورو واتە تا هاتنی دوانیشانەکانی قیامەت، ئەونیشانانەش

---

([1]) - (مسندأحمد(١٢/٦-٧)رقم(٧٠٤٠)شرح أحمد شاكروقال:( إسنادهصحيح)

زۆرن وەك: (هاتنی دەجال،دابەزينی عيسای كوڕی مەريەم،هاتنی ياجوج و ماجوج...)

تا ئێرە دەتوانين بڵێين بەو تەرتيبە يەك بەدووای يەك دادێن!؟ بەڵام ئەو نيشانانەی تر ناتوانرێت تەرتيبيان بۆ دابنێين چونكە تەرتيب نەكراون لە ڕيوايەتەكان پێش وپاش خراون و تەنيا خوای گەورە دەزانێت كەكاميان پێش كاميان دەكەوێت ئێمەش بەبێ بەڵگە لەسەری دەوەستين إن شاءالله وەك: (...هاتنی دووكەڵێكی گەورە(الدخان)، هەڵهاتنی خۆر لەخۆرئاواوەو داخستنی دەرگای تەوبە، دەرچوونی گياندارێك(الدابة)، ڕوودانی سێ ڕۆچوونی گەورە لەسەر زەوی، ئاگرێك لەقوڵايی عەدەنەوە خەڵكی ڕاپێچ دەكات و كۆيان دەكاتەوە بەرەو مەحشەر).

## پرسیاری بیست و سێ

**خوای گەورە چۆن گیانی كەسێكی باوەڕدارو، بێ باوەڕدەكێشێت؟**

### وەڵامی پرسیاری بیست و سێ:

**چۆنییەتی گیان كێشانی باوەڕدار:** پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەربارەی گیان كێشانی باوەڕدار دەفەرموویت: ئەگەر بەندەی باوەڕدار لە دونیا دابڕاو بەرەو قیامەت وەرچەرخا، لەئاسمانەوە فریشتە دێتە خوارەوە بۆلای، ڕوویان سپییە، دەم و چاویان دەڵێی خۆرە، كفنیان پێیە لەكفنی بەهەشت، مۆمیاو بۆنیان پێیە لەبۆنی بەهەشت، دێن و بەدەوریدا بە ئەندازەی دوورایی بینینی چاو دادەنیشن(واتە هێندەزۆرن) ئینجا فریشتەی گیان كێشان (ملك الموت) سەلامی خوای لێ بێت، دێت و لەلای سەرییەوە دادەنیشێت و دەڵێ: ئەی نەفسی پاك وەرە دەرەوە بۆ لێخۆش بوون و ڕەزامەندی خوا، پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾دەفەرموێت: وەك چۆن دڵۆپە ئاو لەدەمی گۆزەوە دەتكێت ئاوا ئەو گیانە دەردەچێت، ئینجا دەیكێشێت و بەئەندازەی چاو تروكاندنێك لەدەستیدا نایهێڵێتەوە بەڵكو هەڵی دەگرن و دەیخەنە كفن و بۆنەكەوە ئەوەیە كەخوای گەورە دەفەرموێت: **(إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ)**[1]واتە: ئەو كاتەی كەمەرگ ئێخە بەیەكێكیتان دەگرێت نێرراوەكانمان دەیمرێنن و فەرامۆشی ناكەن.، ئەو گیانە بۆنێكی لێ دێت وەك خۆشترین بۆنی سەر زەوی وایە.[2]

---

(1) - (الأنعام/٦١)

(2) - (رواه‌احمد و ابو داود،وهو صحيح على شرط الشيخين).

**چۆنییەتی گیان کێشانی بێ باوەڕ:** پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەربارەی گیان کێشانی بێ باوەڕ دەفەرمووێت: ئەگەر بەندەی بێ باوەڕ لەدونیا دابڕاو بەرەو قیامەت گەڕایەوە ، لەئاسمانەوە فریشتەی بۆ دادەبارن، ڕقن وبەهێزن، دەم و چاویان ڕەشە، کفنی زبری موویی یان پێیە، بەئەندازەی دوورایی بینینی چاو بەدەوریدا دادەنیشن، ئینجا فریشتەی مەرگ(ملك الموت) دێت لەلای سەرییەوە دادەنیشێت و دەڵێ: ئەی نەفسە پیسەکە وەرە دەرەوە بۆ ڕق و تووڕەیی خوای گەورە، پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرمووێت: گیانەکە بەلاشەیدا بڵاو دەبێتەوە، ئەویش بەدەرکێشان دەری دەکێشێت وەك چۆن دڕك لەخوری تەڕ دەردەکێشرێت وڕەگ ودەمارەکانی پێوەی دەپچڕێن، ئینجا هەمو فریشتەکانی ئاسمان نەفرینی لێ دەکەن و دەرگاکانی ئاسمان دادەخرێن، دەرگاوانەکانی هەر دەرگایەك لەخوا دەپاڕێنەوە بۆ ئەوەی ڕۆحەکەی بەلایاندا بەرز نەکرێتەوە، ئینجا فریشتەی مەرگ دەیکێشێت و بەئەندازەی چاوترو کاندنێك لەدەستیدا نایهێڵێتەوە بەڵکو دەیخەنە ئەو کفنە زبرەوەو بۆنی بۆگەنترین کەلاکی سەرزەوی لێ دێت.[1]

---

(1) - (تكملة الحديث السابق).

## پرسیاری بیست و چوار

**سەبارەت بە زیندووکردنەوەی مردووەکان پێغەمبەر ئیبراهیم (علیەسلام) داوای لە خوای گەورەکرد کەچۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە؟ تەنیا بۆ دڵنییای، هەر بۆیە قورئانی پیرۆز ئەو داواکارییەی بۆ تۆمار کردوین لەچی ئایەتێك و سورەتێکی قورئان دایە ئەو ڕووداوە؟**

### وەڵامی پرسیاری بیست و چوار:

سەبارەت بەم ڕووداوە لەسورەتی (البقرة)دایە لە ئایەتی (260) کەخوای گەورە لەسەر زمانی ئیبراهیم(علیەالسلام) دەفەرموێت: **(وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِي قَالَ فَخُذۡ أَرۡبَعَةٗ مِّنَ ٱلطَّيۡرِ فَصُرۡهُنَّ إِلَيۡكَ ثُمَّ ٱجۡعَلۡ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٖ مِّنۡهُنَّ جُزۡءٗا ثُمَّ ٱدۡعُهُنَّ يَأۡتِينَكَ سَعۡيٗاۚ وَٱعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ)**[1]

واتە: وەبیربێنە و باسی ئەمە بکە کە ئیبراهیم بۆ ئەوەی لە پلەی'علم الیقین' وە بگاتە پلەی'عین الیقین' وتی: ئەی پەروەردگاری من! نیشانم دە- با بەچاوی سەر ببینم- کە تۆچۆن مردووان زیندوو ئەکەیتەوە، خوای گەورەش فەرمووی: مەگەر تۆ هێشتا بڕوات بەزیندوو بوونەوە نییە؟! ئیبراهیم وتی: بەڵێ چاك باوەڕم هەیە، کە تۆ دەتوانی مردووان زیندوو بکەیتەوە، بەڵام حەز دەکەم بە چاو بیبینم بەتەواوی، خوای گەورە فەرمووی: دەسا چوار پەلەوەر بگرە و جوان سەرنجیان بدە، ئەوسا هەر چواریش سەربڕە، ئینجا پەل پەلیان کەو خوێن و گۆشتەکەیان تێکەڵ بکەو بیانکە چوار پارچەوە،

[1] - (البقرة/ ٢٦٠)

پاشان هەر پارچەیەکیان لەسەر لوتکەی کێوێك دانێ ، ئەوجا بانگیان بکە و؛ بە فەرمانی خوا بەپەلە' زیندوو دەبنەوەو دێنە لات وهەر پارچەی لەگەڵ پارچەکەی خۆیدا یەك دەگرێتەوە، بزانە و بێگومانبە کە خوا چەندە دەستەڵاتدارە، کاردروستە 'بییەوێ هەرئیشێ بکات ئەیکات و، پڕپشە لە حیکمەت'.

**ڕێنمایی لە سورەتی البقرة ئایەتی (٢٦٠):**

١. مرۆڤ بە سروشت حەزی لە زانینەو هەر لە هەوڵدایە بۆی، لە هەر شتێ تێنەگا بۆی دەکۆشێ تێبگاو بیزانێ، بەڵام هەوڵدانەکەشی تا سنورێکە و نابێت زیادەڕەوی تێدا بکات.

٢. خۆشەویستی خوا بۆ ئیبراهیم بێ سنوورە، بۆیە وەڵامی دایەوە و نیشانەشی خستە پێش چاوی تا پتر دڵنیابێ.

٣. چەسپاندنی ژیانێکی دووەم-پاش مردن- بۆ پاداش و تۆڵە.

٤. زیاد بوونی ئیمان و باوەڕ بە تێڕوانین وبیرکردنەوە لە نیشانەکانی خوای گەورە.

**تێبینی:** ئێمەش لەم کورتە تەفسیرەدا ناوی پەلەوەرەکانمان -وەك هەندێ ریوایەت دیارییان دەکات- دیاری نەکرد چین؟ چونکە قورئانیش ناوی دیاریی نەکردوون، بێ لەوەیش ئەوەی کە لەم جێگایەدا گرنگ بێت هەر ئەمەیە کە: زیندووکردنەوەی مردووان بۆخوای گەورە، کارێکی زۆرئاسانە، تەنها فەرمانێکی خوایی بەسە.(تەفسیری ڕامان)

## پرسیاری بیست و پێنج

**کاتێك شەیتان دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، وتارێك دەدات بۆ دۆزەخییەکان کە ئەوەندەی تر باری سەرشەنیان قورس تر دەکات!. خوای پەروەردگاریش ئەووتارەی بۆ تۆمارکردوین لەقورئانی پیرۆزدا لەکام ئایەت و سورەت دا خوای گەورە بۆمانی تۆمارکردووە؟**

### وەڵامی بیست و پێنج:

سەرسوڕ هێنەر ترین باری دۆزەخییەکان بریتییە لە ووتاردانی شەیتان بۆیان، کە ئەم ووتارە زۆر کار دەکاتەسەر دەروونی بیسەری ووتارەکە بەڕاستی، پاش ئەوەی مینبەرێك لەناو دۆزەخ دا بۆ شەیتان دروست دەکرێت و وتارێکیان بۆ دەدات کەمەینەت و پەژارەیان زیاتر دەکات زیاتر خەم و دەرونیان دادەگرێت و ئازار لەسەر ئازاریان توندتر دەبێت چونکە ئەم وتارەدەبێتە هۆی پەشیمانی دۆزەخییەکان وئاخ هەڵکێشانیان، کەچۆن بەنەفامی شوێن فێڵباز و ساختەچیەکی ئاوا کەوتون و لەوڕۆژەدا ئەویش ئەمە وەفاکەیەتی ، جا قورئانی پیرۆز ئەم وتارەی بۆ تۆمار کردووین وەك خوای گەورە باسمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّ إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾[1]

---

(1) - (إبراهيم/٢٢)

واتە: جاکە کار لەکار ترازاو هەموو شتێك بڕایەوە، واتە: بەهەشتی بۆ بە هەشت نێردراو، دۆزەخیش بۆ دۆزەخ، ئیتر دۆستە مەزن و گەورەکەیان (شەیتان) سەرزەنشتیان دەکاو دەڵێت: بێگومان خوا لەدونیادا لەسەر زمانی پێغەمبەران بەڵێنێکی راست و دروستی پێدان بەزیندوو بوونەوەو جەزاو پاداشت، وا هێنایە دی و منیش بەڵێنی ناڕاست و درۆو دەلەسەم پێدان، بەڵام من بەڵێنەکەی خۆمم نەبردە سەرو بەپێچەوانەوە فریوم دان و، ناتوانم یارمەتیتان بدەم، خۆ لەوکاتەیشدا هیچ هێزو دەسەڵات و بەڵگەو نیشانە یەکم بەدەستەوە نەبوو، هەتا بەزۆر گوێرایەڵتان بکەم، ئەمە نەبێت کە گومان و دوو دڵیم بۆ پەیداکردن و، بانگم کردن بۆ گومڕایی، خێرا ئێوەیش وەڵامتان دامەوەو بەگوێتان کردم و بەدەنگمەوە هاتن، جاکەوابوو ئەمڕۆ کەئێوە دووچار بوون، سەرکۆنەو سەرزەنشتی من مەکەن، بەڵکو لۆمەو سەرزەنشتی خۆتان بکەن و من ناتوانم فریاتان کەوم، هە تا لەسزا ڕزگارتان کەم و ئێوەیش ناتوانن فریای من بکەون، هەتا لەسزا رزگارم بکەن ، دڵنیاشبن کە من بێزارم لەوە کە لەبەرا (واتە: لەدونیادا) منتان کردە شەریك و هاوەڵی خواو بەگوێتان کردم، ئەوجا خوای گەورە دەفەرموێ: بەراستی ستەمکاران، ئەوانەی پشتیان لەهەق کرد، سزای ئێش پێگەیەنەروو ناڕەحەتکەریان بۆهەیە.

بەم شێوەیە دووای وتارەکەی شەیتان، بێباوەڕان و هاوبەش پەیداکەران و دووڕوان و ئەهلی دۆزەخ، هەموو ئەوانەی لەدونیادا پشتیان لەبەرنامەی خوای گەورە کردووەو دژایەتی بانگەوازی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانی ئەودینە پاك و ڕاستەیان کردووە، بەهۆی ئەوەی لەلەدونیادا فریویان

خواردووە بە بەڵێنەکانی شەیتان و سەرجەم ئەو وەسوەسەوە گومانانەی کەبۆیان دروستکراوە لەسەر ڕۆژی پاداشت و سزاو گەڕانەوەیان بۆ لای خوا بەڕاستیان زانیوە، هەر بۆیە کاتێك بەچاوی سەری خۆیان ڕاستەقینەیی ئەو ڕۆژە دەبینن و پاشانیش ڕسوایی شەیتان و لاوازی و بێهێزی دەبینن کە لەجیاتی دۆزینەوەی ڕێگە چارە بۆ خۆی و شوێنکەوتوانیشی داوا لەوان دەکات کە ڕێگەی ڕزگاری بۆ پەیدا بکەن!، کە هێندەی تر نائومێدیان دەکات و ناڕەحەتی و ئازارەکانیان زیاتر دەکات ، چونکە شەیتانیش بۆ خۆی لەحاڵێکی باش دا نی یەو بگرە سزای شەیتان چەند بەرامبەرەو بەسەختترین شێوە خوای گەورە سزای لوت بەرزی و بێباوەڕی و لەخشتە بردن و بەلاڕێبردنی نەوەی ئادەمی دەدات.

## پرسیاری بیست وشەش

**مەبەست لەنەفخی صور(فوکردن بەکەڕەنا)دا چییە؟ وەچەند فوکردن بەکەڕەنادا هەیە؟ کاتێك ئەم فووە دەکرێت لە و کاتەدا چی ڕوودەدات؟ وە ماوەکانی نێوانیان چەندە؟**

### وەڵامی پرسیاری بیست و شەش:

وەك لە پرسیارەکانی پێشوودا باسمان کرد کەوا خوای گەورە هەر فریشتەیەو کارێکی پێ سپاردوە کەجێ بەجێی بکات وە یەکێك لەو فریشتانەی کە ناومان هێنا (**ئیسر افیل**)ە(علیەالسلام) کەوا ئەرکی نەفخی صوری لە سەرە کەبەفەرمانی خوای گەورە فووی پێدا دەکات، هەرکات خوای گەورە فەرمانی پێ کرد دەست بەجێ دوو فوو دەکات فوویەکیان هەرچی خوا ویستی لەسەربێت گیانی دەکێشیت و بوونەوەر تێك دەچێت وە فوی دووەم خەڵکی هەموو زیندوو دەبنەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: **(وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ)**[1] واتە: لەو ڕۆژەدا فوودەکرێت بەکەڕەنادا (مەگەر خوا بزانێت چی دەزگایەکە) هەر کەس لەئاسمانەکان و زەوی دا مابێت خێرا دەمرێت و، مەگەر کەسێك خواویستی لەسەر مردنی نەبێت، لەوە و دووا فوویەکی تری پیادا دەکرێتەوە جا دەست بەجێ هەر هەموو خەڵکی هەستاونە تەوە سەرپێ و بەسەرسامییەوە چاوەڕوانن، کەواتە بونەوەرو ژیان بەفەرمانی خوای گەورەیە بەندە بەنەفخی صورەوە هەرکات ویستی لە سەربێت ئەو

---

([1]) - (الزمر/٦٨)

جیهانەی لە نەبوونەوە هاتۆتەوە بوون ئاوهاش دەگەڕێتەوە بۆخاڵی بنەڕەتی خۆی.

وەك ئاماژەمان پێدا کەدوو فوو دەکرێت بەکەڕەنادا،کاتێك ئیسرافیل فووی یەکەم دەکات بەنەفخەکەدا ڕێسای هەمو بوونەوەر تێك دەچێت و بەم شێوەیەدەگۆڕێت:

**یەکەم: ئاسمان شەق دەبات و خۆر دەکوژیتەوەو ئەستێرەکان هەڵدەوەرن وزەوی و شاخەکان گرمەو ناڵەدەکەن و دەریاکان دەتەقنەوە**،وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: **(فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ) وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ ) فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ) وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ)**[1] واتە: ئەگەر فووکرا بەکەڕەنادا هەر تەنها فوویەك و زەوی و شاخەکان بارگران بون و پێکدادران و گرمەیان کرد، هەرتەنها گرمەیەك، ئەوا ئەو ڕۆژە ڕوداوە سامناکە کە ڕوودەدات وئاسمان شەق دەبات چونکە لەو ڕۆژەدا لاوازەو هیچی بەسەر هیچیەوە نامێنێت.

**دووەم: هەموو بوونەوەر گۆڕانی بەسەردا دێت و بە پێچراوەیی دەکەوێتە دەستی خوای گەورەوە**،وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: **(يَقْبِضُ اللَّهُ الأَرْضَ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَيَطْوِي السَّمَاءَ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا المَلِكُ، أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ؟)**[2]واتە: خوای گەورە زەوی هەڵدەگرێت و ئاسمانەکان بەدەستی ڕاستی دەپێچێتەوە، پاشان دەفەرمووێت: من پاشام، پاشاکانی سەزەوی لەکوێن؟.

---

([1]) - (الحاقة/١٣/١٦)

([2]) - (رواه البخاري)

**سێیەم:** هەرچی گیان لەبەرە بەزیندەوەرو مرۆڤ و ئاژەڵ و جنۆکەو فریشتەوە هەموویان دەمرن و کەس نامێنێت بێجگە لەوەی خوای گەورە دەیەوێت نەمرێت، وەك خوای گەورەدەفەرمووێت: (وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ)[1] واتە: فوو دەکرێت بەکەڕەنادا و هەرچی لەئاسمانەکان و ئەوەی لەزەوی دایە دەست بەجێ دەمرن! مەگەر کەسێك خوابیەوێت نەمرێت.

هەروەهاخوای گەورە باسی پڕتاوی ئەو شریخەو مەرگە دەکات و دەفەرمووێت: (يَنظُرُونَ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ تَأۡخُذُهُمۡ وَهُمۡ يَخِصِّمُونَ ) فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ تَوۡصِيَةٗ وَلَآ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ يَرۡجِعُونَ)[2] واتە: لە گرمەو هاوارێك کە فووی یەکەمە زیاتر چاوەڕوانیان ناکات، دووچاری دەبن و لە ناویان دەبات، لەو کاتەدا خەریکی قرەو هەراو دژایەتی یەکترن، نەدەتوانن وەسیەتێك بکەن و نەبۆلای کەس وکاریان دەگەڕێنەوە.

**سەبارەت بەفووی دووەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ قَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَرْبَعُونَ يَوْمًا ؟ قَالَ أَبَيْتُ، قَالُوا: أَرْبَعُونَ شَهْرًا ؟ قَالَ : أَبَيْتُ، قَالُوا: أَرْبَعُونَ سَنَةً ؟ قَالَ : أَبَيْتُ، ثُمَّ يُنْزِلُ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيَنْبُتُونَ، كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ قَالَ وَلَيْسَ مِنَ الْإِنْسَانِ شَيْءٌ إِلَّا يَبْلَى، إِلَّا عَظْمًا وَاحِدًا، وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[3]

---

(1)-(الزمر/٦٨)

(2) - (يس/٤٩-٥٠)

(3) - (صحيح مسلم)

واتە: ماوەی نێوان دوو فووەکە چلە! یەکێك لەهاوەڵان وتی: چل ڕۆژە؟ فەرمووی: ڕێگەنەدراوم، وتی: چل مانگە؟ فەرمووی: ڕێگەنەدراوم، وتی: چل ساڵە؟ فەرمووی: ڕێگەنەدراوم، واتە: ڕێگەنەدراوم باسی بکەم، فەرمووی: پاشان خوای گەورە ئاوێك لە ئاسمانەوە دەبارێنێت، ئینجا خەڵکی وەك دانەوێڵە دەڕێنەوە، هیچ شوێنێکی لاشەی مرۆڤ نامێنێت نەڕزێت، تەنها ئێسقانێك نەبێت ئەویش (کلێنچکەیە) ڕۆژی دووایی خەڵکی لەوە دروست دەکرێنەوە.

ئینجا فووی دووەم دەکرێت بەکەڕەنا(نفخی صور)دا سەرجەم خەڵکی رادەچەنن و ڕاست دەبنەوەوە،وەك خوای گەورەدەفەرموێت: **(نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ)**[1] واتە: پاشان فوویەکی تر دەکرێت بە کەڕەناداو هەموویان ڕاست دەبنەوەو دەڕوانن.

هەروەها لەشوێنێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: **(وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ) قَالُواْ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَاۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ)**[2] واتە: وە (جارێ تر) فوو دەکرێ بە کەڕەنادا ئینجا ئەوان کوتوپڕ لە گۆڕەکان دێنە دەرەوە و بەپەلە دەڕۆن بۆ لای پەروەردگاریان، دەڵێن ئەی هاوار بۆ ئێمە کێ زیندووی کردینەوە لە گۆڕەکانمان دا ئەمە ئەو بەڵێنەیە خوای میهرەبان پێ ی داین و پێغەمبەرەکان ڕاستیان کرد.

---

(1) - (الزمر/٦٨)

(2) - (يس/٥١/٥٢)

## پرسیاری بیست وحەوت

**ئایا لەڕۆژی دووا یدا لەسەرئەم زەوییەی کە لەدونیادا لەسەری دەژین کۆدەکرێینەوەو دادگایی دەکرێین؟ ئەگەر بەڵێ بەڵگە چییە؟ ئەگەر نەخێر بەڵگە چییە؟ وەشێوازی زەوییە کەچۆنە؟**

### وەڵامی پرسیاری بیست و حەوت:

خوای گەورەلەڕۆژی دوایی دا کاتی لێپرسینەوە ئەم زەوییەی کە لەسەری دەژین دەگۆڕێت بۆ زەوی یەکی تر هەرووەك دەفەرمووێت: **(یَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّار)**[1] واتە: ڕۆژێك دێت کەزەوی دەگۆڕێت بەزەوی یەکی تروئاسمانەکان دەگۆڕێن و بەمل کەچی بۆخوای تاك و تەنهاو زاڵ دەردەکەون.

سەبارەت بەشێوەی ئەو زەویەش پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: **(يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ النَّقِيِّ لَيْسَ فِيهَا عَلَمٌ لِأَحَدٍ)**[2]

واتە: خەڵکی ڕۆژی دووایی لەسەرخاکێکی سپی سورباوی وەك نانی بێگەرد کۆدەکرێنەوە، وەهیچ نیشانەو بەرزی و نزمییەکی بۆ کەس تێدا نییە.

---

(1) - (إبراهيم/٤٨)

(2) - (صحيح مسلم)

## پرسیاری بیست وهەشت

**كۆمەڵێك كەس لەئوممەتی ئیسلام بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە؟ ئایا ژمارە یان چەندە؟ وەسیفەتیان چۆنە؟ وەهەریەكێك لەوان چەندی تر لەگەڵ خۆی دا دەباتە بەهەشت؟**

### وەڵامی پرسیاری بیست و هەشت:

چەند كۆمەڵێك لەباوەڕداران بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت، بەوپێیەی كە چەندەها سیفەتی باش و نیشانەی پەسەندیان هەیە، كەدەیان گەیەنێتە ئەو ئاستەی خوای گەورە بەمیهرەبانی خۆی و بێ لێپرسینەوە بیان خاتە بەهەشتەوە، وەك پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت: (حەفتا هەزار كەس هەن كەبەبێ لێپرسینەوەو سزا دەچنەبەهەشتەوە) كەباسی كردوون ئەوانە كێن و لەباسیان دا دەفەرموێت: **(همُ الذینَ لایسترقون و لایتطیرون و لایكتوون و علی ربهم یتوكّلون)**[1] واتە:ئەوانە كەسانێكن داوا لە كەس ناكەن لە كاتی نەخۆشیدا دوعاو نزایان بۆ بكەن هەر چەندە درووستە، وە داوا لە خەڵكی ناكەن كەلەشیان داخ بكەن بەمەبەستی چارەسەر هەرچەندە درووستە، وە ڕەشبین نابن بەباڵندە، وە لە هەموو كارو بارێكدا تەنها پشت بەخوا دەبەستن.

تێبینی: سەبارەت بەڕەش بینی باڵندە: وەك دەڵێن ئەگەر كونەپەپوو بەسەر ماڵ دا بخوێنێت توشی زیان دەبن، ئەمەش بیرو بۆ چوونیكی نەفامییە، یان باڵندە بەئاسمان دا هەڵ دەدا ئەگەر بەلای ڕاست دا بفرییایە گەشتیان

---

(1) - (متفق علیه)

دەکردو ئەگەر بەلای چەپ دا بفڕیبایە گەشتیان نەدەکرد، وەدەیان ووت:ئەوگەشت کردنەخراپەیان زۆر شتی تر...[1]

سەهلی کوڕی سەعد(خوای لێ ڕازیبێت) فەرموویەتی:پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: **(يَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعُونَ أَلْفاً، أَوْ سَبْعُمِائَةِ أَلْفٍ مُتَمَاسِكُونَ. آخِذٌ بَعْضُهُمْ بَعْضاً. لاَ يَدْخُلُ أَوَّلُهُمْ حَتَّى يَدْخُلَ آخِرُهُمْ وَجُوهُهُمْ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ)**[2] واتە: بەڕاستی دەچنە بەهەشت لە ئوممەتەکەم حەفتا هەزار یان حەوت سەد هەزار، یەکەمیان (سەرەتایان) ناچێتە ژوورەوە هەتا دوواهەمینیان نەچێت، ڕوویان لەوێنەی مانگە لەشەوی چواردەدا.

وە لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کەپێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: **(أعطيت سبعين ألفاً من أمتي يدخلون الجنة بغير حساب، وجوههم كالقمر ليلة البدر، قلوبهم على قلب رجل واحد، فاستزدت ربي عزوجل، فزادني مع كل واحد سبعين ألفاً)**[3]

واتە: بەحەفتا هەزار لەئوممەتەکەم درا کەبەبێ لێپرسینەوە بچنە بەهەشتەوە، ڕوویان وەك مانگ وایە لەشەوی چواردەدا، دڵیان لەسەر دڵی یەك پیاوە، داوای زیاترم کرد لەپەروەردگاری مەزن، زیادی کرد بۆم کە لەگەڵ یەکێکیان حەفتا هەزار دەچێتە بەهەشت.

---

(1) - بۆ زیاترزانیاریت سەیری(فتح المجيد-ص ٦٨)بکە.
(2) - (فتح الباري ٣١٩/٦)
(3) - (صحيح الجامع ١/٣٥٠رقم ١٠٦٨)

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾دەفەرمووێت: **(وعدني ربي أن يدخل الجنة من أمتي سبعين ألفاً بلا حساب عليهم ولا عذاب، مع كل ألف سبعون، وثلاث حثيات من حثيات ربي)**[1]

واتە: پەروەردگارم پەیمانی پێداوم کەحەفتا هەزار لەئوممەتەکەم بەبێ لێپرسینەوەو بەبێ سزا دەچنە بەهەشت، لەگەڵ هەر هەزارێك حەفتا هەزار دەچێتە بەهەشتەوە.

(1) - (صحيح الجامع ١٠٨/٦رقم٦٩٨٨)

## پرسیاری بیست و نۆ

### پێناسەی قەزاو قەدەر چییە؟

### وەڵامی پرسیاری بیست و نۆ:

پێناسەی قەزاو قەدەر: واتە: ئەندازەگیری و مەزەندەو بڕیاری خوای گەورە سەبارەت بەدروست کراوەکانی بەپێی زانیاری پێشینەو بەگوێرەی کاربەجێی و دانایی خۆی، خوای گەورە دەفەرموویت: **(إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ)**[1] واتە: ئێمە هەموو شتێکمان بەئەبدازەیەك درووست کردووە.

هەروەها دەفەرموویت: **(وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ)**[2] واتە: هەمووشتێك لای خوای گەورە بەئەندازەوبڕێکی دیاریکراوە.

**زیادەیەك لەسەرباوەڕ هێنان بەقەزاو قەدەر کەچەند خاڵێکی گرنگ دەگرێتەوە:**

**یەکەم:** باوەڕهێنان بەوەی کەخوای گەورە زانیاری دەربارەی هەموو شتێك هەبووەو هەیە بەوردوو درشتییەوە لەئەزەلەوە هەتا هەتایە پەیوەست بێت بە فەرمانەکانی خۆیەوە یان پەیوەست بێت بەفەرمانی بەندەکانییەوە.

**دووەم:** باوەڕهێنان بەوەی خوای گەورە سەرجەم زانیارییەکانی دەربارەی ژیان و بونەوەر لە(لوح المحفوظ)دا تۆمارکردووە.

**سێیەم:** باوەڕهێنان بەوەی کە هەرشتێك لەبوونەوەر دا ڕووبدات بەویستی خوای گەورە ڕوودەدات، پەیوەست بەفەرمانەکانی خواوەیان پەیوەست بێت بەفەرمانەکانی دروست کراوەکانییەوە.

---

(1) - (القمر/٤٩)

(2) - (الرعد/٨)

**چوارەم:** باوەڕ هێنان بەوەی هەرچی لە بوونەوەردایە بەخۆیی و سیفەت و جوڵەیەوە دروست کراوی خوای گەورەیە.

**پێنجەم:** باوەڕهێنان بەوەی هەرچی لەبوونەوەردا ڕوودەدات سەبارەت بەخوای گەورە چاکە و خێرەو بەپێی کار بەجێی و دادگەری خۆی ئەنجامی دەدات، چونکە خوا هیچ شتێك درووست ناکات و هیچ فەرمانێك ئەنجام نادات، شەڕی تەواوەتی بێت و هیچ خێرێکی تێدا نەبێت، گەرچی سەبارەت بەدروستکراوەکانی ئەوەی بەخێر بۆیان تەواو بێت خێرەو ئەوەی بەشەڕ ڕوویان تێبکات شەڕە.

## پرسیاری سی

**کیتابی (لوح المحفوظ)چی کیتابێکە؟ وەچەند ساڵ پێش دروست کردنی ئاسمان وزەوی نوسراوەتەوە؟**

### وەڵامی پرسیاری سی:

کیتابی(**لوح المحفوظ**): ئەو پەڕتوکەیە کە خوای پەروەردگار پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی درووست بکات بەپەنجا هەزار ساڵ ئەندازەگیری درووست کراوەکانی نوسیوە تێیدا، وەك خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: **(أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ)**[1]واتە: ئایا نابینیت کەخوا دەزانێت چی لەئاسمان و زەوی دایە؟ هەموو ئەو زانیاریانەش لەنوسراودایە، واتە لە (لوح المحفوظ) ئەوە گشتی بەلای خواوەئاسانە. هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: **(كَتَبَ اللَّهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ )**[2]

واتە: خوای گەورە ئەندازەگیری درووستکراوەکانی نوسیوە پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی درووست بکات بەپەنجا هەزار ساڵ.

---

(1) - (الحج/٧٠)

(2) – (رواه المسلم)

## پرسیاری سی و یەك

**هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلام چین و كامانەن بەبەڵگەی شەرعییەوە؟**

### وەڵامی پرسیاری سی و یەك:

**یەكەم:** هاوبەش دانان بۆ خوا لە پەرستنیدا خوای گەورە دەفەرموێت: **[اِنَ اللّهَ لا يَغفِرُان يُشرك به ويَغفِرُما دونَ ذلِكَ لِمَنْ يشاء]**[1]

واتە: بێگومان خوا لەوانە خۆش نابێ هاوەڵ و هاوەبەشی بۆ دانێن تاوانی كەمتر لەشیرك بۆ هەركەسێك خۆی بیەوێ وشایستە بێت ئەبوری.

لەشوێنێكی تردا دەفەرموێت: **[اِنهُ مَن يُشرِكْ باللّهِ فَقَد حرّم اللّهُ عَليهِ الجنّةَ ومأْواهُ النارُّ وماللظالمين مِن أنصار]**[2] واتە: چاك بزانن كە هەركەسێك شەريك و هاوبەش بۆخوا دابنێ بێ شك خوا بەهەشتی لەسەر یاساغ دەكا و جێ و شوێنی ئاگرە. ستەمكارانیش هیچ جۆرە یارمەتی دەرێكیان بۆ نییەو رزگار نابن.

پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەیەوە دەفەرموێ: **(إن الجَنَّةَ لا يَدْخُلُهَا إلا نَفْسٌ مسلمةٌ - وفي لفظ - مؤمنةٌ )**[3]

واتە بەدەر لەموسڵمان كەسی تر ناچێتە بەهەشتەوە.

وە لەم جۆرە هاوبەش دانانە وەكو: پاڕانەوە لە مردووان و هاوار كردن لێیان و نەزر كردن و قوربانی كردن بۆیان.

---

(1) - [النساء/١١٦]

(2) - [المائدة/٧٢]

(3) - (فتح البارى).

**دووەم:** هە رکەسێ لە نێوان خۆیی و پاشان لە نێوان خوادا چەند واستەیەك دابنێ و لێیان بپاڕێتەوەو داوای شەفاعەتیان لێ بکات وپشتیان پێ ببەستێتەوە کافر بووە بە ئیجماعی زانایان.

**سێیەم:** هەر کەسێ هاوبەش دانەرەکان بەکافر نەزانێ وە یان گومانی هەبێت لە کافرێتیاندا یان ڕێچکەو ڕێبازەکەیان بە ڕاست بزانێ ئەوا کافرە.

**چوارەم:** هەر کەسێ بروای وابێت کە ڕێبازێکی تر جگە لە ڕێبازەکەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ تەواوە یان حوکمی غەیری ئەو چاکترە، وەکو ئەوانی حوکمی تاغوتەکان ئەدەن بەسەر حوکمی دا ئەوانە کافرن.

**پێنجەم:** هەر کەسێ ڕقی لە شتێك بێت لەوانەی کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هێناویەتی با کردەوەشی پێ بکات، ئەوە کافر بووە بەپێ ی وتەی خوای پەروەردگار کەدەفەرمووێت: **[ذلك بِانّهُم كرِهوا ما انزلَ اللهُ فَاحْبَطَ اعمالهُم]**[1] واتە: ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە بەڕاستی ئەوان ڕقیان لەوپەیامە دەبووەوە خوا دایبەزاندووە جا خوایش کارەکانیانی بێ ئاکام کردەوە.

(حبوط) لە بنەڕەتا بریتیە لە ئاوسان و (با کردنی) سکی ئاژەڵ، بەهۆی جۆرە گیایەکەوە کە دەیخوات سەرەنجام ئەیکوژێ و تیا ئەچێ، هەر بەو شێوەیەش کاری بێ بڕواکان زۆرو گەورە ئەبێ، تا دەرەنجام خوای گەورە پووچەڵی ئەکاتەوەو سوودی نامێنێ بۆیان.

---

(1) - [محمد/٩]

**شەشەم:** هەرکەسێ گاڵتە بە شتێ بکات لە دینەکەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وەکو ئەوەی گاڵتە بکات بە باسی ناو گۆڕو قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ، بەڵگەش ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت: **[قُل أبالله و آياته وَرَسُولِهِ كُنْتُم تَسْتَهْزِئونَ لا تَعتذِرُوا قَد كَفَرتُم بُعْدَ ايمانِكُم]**[1]

واتە: ئەی محمد﴿ﷺ﴾ پێیان بڵێ: ئەوە بەخوای گەورە و ئایەتەکانی وە پێغەمبەرەکەی گاڵتە ئەکەن، بە هۆی ئەو کارەتانەوە ئیتر (بەهانە) مەهێننەوە چونکە ئێوە کافر بوون دوای ئەوەی کە ئیمانیشتان هێنابوو.

**حەوتەم:** جادووگەرێتی: بۆنمونە: (الصرف) کە بریتی یە لە کارێکی جادووگەرێتی، مەبەست تیایدا گۆڕانی ئارەزوی مرۆڤە وەکو گۆڕینی خۆشەویستی پیاو بۆ ژنەکەی بۆ ڕق لێ بوونەوە واتە: نوشتەی ڕەشی، وە (العطف) کە بریتییە لە کارێکی جادووگەرێتی مەبەست تیایدا شیرین کردنی ئەو شتەیە کە مرۆڤ ئارەزووی لێی نییە بە ڕێگەی شەیتانی، لەبەر ئەوە هەرکەسێك بیکات یان پێی ڕازی بێت ئەوە کافرە. خوای گەورە ئەفەرموێت: **[وما يُعلَمان مِنْ أحد حتى يَقُولا انَّما نَحْنُ فتْنَة فلا تَكْفُر]**[2]

واتە: وە لەهەمان کاتدا هەر کەسێکیان فێری جادوو دەکرد لە سەرەتاوە پێیان دەگوت: ئەم کارەی ئێمە تەنها بۆ تاقیکردنەوەو فێر بوونی جیاکردنەوەی (موعجیزە) و(سیحرە) و لەلایەن خواوە نێردراوین، کەوابوو ئاگادار بە! خۆت کافر مەکە و فێری جادوو نەبیت.

---

(1) - [التوبة/٦٥-٦٦]

(2) - [البقرة/١٠٢]

**هەشتەم:** سەرخستن و یارمەتی دانی ئەو موشریکانەی کە دژ بە مسوڵمانانن وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: **[ومن يَتولَهُم مِنكُم فانّه مِنْهم ان اللهَ لا يَهْدى القومَ الظّالمين]**[1]واتە: هەرکەسێ لە ئێوە یارمەتی موشریکەکان بدات ئەوەبە لەوان لە قەڵەم دەدرێت وەخوا خۆی هیدایەتی قەومی ستەمکاران نادات، ستەمکاران لێرەدا بە مانای کافرەکان دێت .

**نۆیەم:** هەرکەس بڕوای وابێت کەوا ئەگونجێت لە غەیری ئیسلام بەرنامەیەکی تر دەست نیشان بکات بۆ هەندێ مەسائیل، واتە: لە شەریعەتی ئیسلام لابدەیت، خوای گەورە دەفەرموێت: **[وَمَنْ يَبْتَغ غَيرَ الإسلامِ ديناً فَلَنْ يُقْبَلَ ِمنْهُ وَهوَ فى الآخرةِ مِن الخاسرين ]**[2]

واتە: هەرکەسێ غەیری دینی ئیسلام دینێکی تر هەڵبژێرێ ئەوا لێی قبوڵ ناکرێ وە لە قیامەتیشا لە خەسارەت مەندەکان دەژمێرێت. دین لێرەدا بەمانای مەنهەج دێت.

**دەیەم:** پشت کردن لەدینی خوا پاشان فێرنەبونی و کار پێ نەکردنی: **[وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ]**[3]

واتە: کێ لەوە ستەمکارترە لەکاتێکدا ئایەتی خوای گەورەی بیر دەخەیتەوە لە پاشا ئەو پشتی تێ ئەکات و ئەو بیر خستنەوەی بەدڵ نییەو پێی ناخۆشە، ئێمە تۆڵە لە موجریمەکان دەکەینەوە.

---

(1) - [المائدة/٥١]

(2) - [آل عمران/ ٨٦]

(3) - [السجدة/٢٢]

**تێبینی**

**یەکەم:** جیاوازی نییە لە هەموو ئەم هەڵوەشێنەرەوانەدا گەرچی کەسێك بە گاڵتەی بێت یاخود بە ڕاستی بێت مەگەر ئەو کەسە زۆری لێ کرابێت، وە ئەگەر هەمووی لە کەسێکدا کۆبویەوە ئەوا لە ترسناکترینیانە، بۆیە پێویستە لەسەر مسوڵمان کە ئاگاداری بێت وەلێی بترسێت نەك لەخۆیدا هەبێت.

**دووەم:** ئەگەر کەسێك بڕوای وابێت کە ئەو دەستورو یاسایانەی کە خەڵکی دای دەنێت وەکو: دیموکراسی و عەلمانیەت و پەرلەمان پێی باشترە لە شەریعەتی ئیسلام یان دەستوری ئیسلام بەکەڵکی کار پێ کردن نایەت لەم سەردەمەدا، وە یاخود بڕوای وابێت کەوا ئەگونجێ حوکم بکرێت بەغەیری شەریعەتی خوا لە مامەڵەکردن یان سنوردانان یاخود غەیری ئەم دووانە، یا بڕواشی وانەبوبێت کە ئەوە باشترە لە حوکمی شەریعەت لە بەر ئەوەی ئەو کەسە حەڵاڵی ئەو شتەی کردووە کەخوا حەرامی کردووە، وەکو زینا و شەراب خواردن و سوو وەرگرتن و حوکم کردن بەغەیری شەریعەتی خوائەوە کافرە بە ئیجماعی مسوڵمانان.

## پرسیاری سی و دوو

**هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان چین وکامانەن بەبەڵگەی شەرعییەوە؟**

### وەڵامی پرسیاری سی و دوو:

هەر وەکو ئاشکرایە کە ئیمان زیاد ئەکات بە عیبادەت کردن وە کەمیش ئەکات بە تاوان کردن، ئەبێت ئەوەش بزانین کە هەندێ شت هەیە ئەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئیمان کە پێویستە هەموو مسوڵمانێك ئاگاداری بێت.

**هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمان دەتوانین لە چوارخاڵدا ڕوونی بکەینەوە:**

**یەکەم: ئینکاری کردن لە بوونی پەروەردگاریتی خوا یاخود تانە لێدانی:**

١. ئینکاری کردنی بوونی پەروەردگار وەکو هەندێ کەس ئەڵێن: **(لا اله والحیاة مادة)** واتە: هیچ خوایەك نیەو ژیان تەنها ماددەیەو هیچی تر.

ئەم جۆرە کەسانە لە موشریکەکانی عەرەب خراپترن و بگرە لە شەیتانیش چونکە شەیتان کاتێ خوای گەورە فەرمانی پێ کرد کرنوشی ڕێز بۆ ئادەم بەرێ وتی: **[خَلَقْتَنی مِنْ نارٍوَخَلَقْتَهُ مِنْ طین]**.[1] واتە: خوایە تۆ منت لە ئاگر دروست کردووەئەویشواتە ئادەم لە قوڕ.

مەبەست لەوەیە شەیتان ئیمانی بە بوونی خوا هەبوو بەڵام ئەم جۆرە کەسانە ئەسڵەن باوەڕیان بە بوونی خوای گەورە نییە، وە ئەگەر کەسێك بڵێ ئەم بوونەوەرە خوا دروستی نەکردووە بەڵکو سروشت کردووە ئەوە ئیمانی بەتاڵ بۆتەوە چونکە کوفری کردووە.

---

(1) - (الاعراف/١٢)

٢. کەسێك بانگەوازی خوایەتی بکات وەکو فیرعەون پەنا بەاللە کە وتی: **[انا ربُّکم الاعْلی]**[1] واتە: من خوای هەرە بەرزی ئێوەم .

٣. ئەگەر کەسێك باوەڕی وابێت کەوا چەند کەسێك هەن لەپیاوچاکان کە ئەم بونەوەرە بەڕێوە دەبەن، ئەوا ئەم جۆرە کەسانە ئیمانەکەیان بەتاڵ دەبێتەوە ئەمانیش لە موشریکەکان خراپترن، چونکە ئەگەر موشریکەکان پێیان بووترایە کێ رۆزی دەرتانە لە ئاسمان و لە زەویدا و کێ گوێو چاوی پێ بەخشیون و کێ شتی زیندوو لە شتی مردوو دەردەهێنێ وەکێ شتی مردوو لە شتی زیندوو دەردەهێنێ وە ئەگەر پێیان بوتریە کێ هەڵسوڕێنەری کاروبارەکانە لە وەڵامدا ئەیان ووت خوای گەورە هەر وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: **[قُلْ مَنْ یَرْزُقُکُمْ مِن السّماءِ وَ الارْضِ أَمَّن یَمْلِكُ السّمعَ والابْصاروَمَنْ یُخرِجُ الحيّ مِن المیتِ وِیُخرِجُ المیّتَ مِنَ الحَیّ ومَن یّدبر الامر، فَسَیقولونَ اللہ فَقُل افلا تَتَّقون]**[2] واتە: بڵێ: کێ لەم ئاسمان و زەوییەدا رزق و رۆزیتان دەداتێ ؟ کێ یە دروستکەرو خاوەنی ئەوگوێ و چاوانەتان؟ ئەی کێیە زیندوو لەمردوو دەردێنێ؟ و مردوو لە زیندو دەردەکا؟ وە کێیە زۆر بەوردیی بۆکاروباری ئەم دونیایە نەخشە دەکێشێ؟ بەزوویی لەوەڵامی هەموو ئەمانەدا دەڵێن: هەر خوایە هەموو ئەوانە دەکات بڵێ: دەسا بۆ لە خوا خۆ ناپارێزن و ناترسن؟

---

([1]) - (النازعات/٢٤)

([2]) - (یونس/٣١)

٤. وتەی هەندێ لەو کەسانەی کە باوەڕیان وایە کە خوای گەورە چۆتە ناو دروستکراوەکانیەوە وەکو (حلولییەکان) بە جۆرێ (ابن عربی)دەڵێ: **(الرَّبُّ عبد والعبدُ ربُّ یاَ لیْتَ شِعری منِ المُکلَّف)** واتە: خوا بەندەیەو بەندەش خوایە، ئاخۆ کامیان تەکلیفیان لە سەرە! وەالحلاج ئەڵێ: من ئەوم و ئەویش منە،والعیاذ باللە.

**دووەم: ئینکاری کردنی خو ایەتی خوا یان هاوبەش دانان بۆی:**

١. وەکو ئەوانەی خۆرو مانگ و ئەستێرە و درەخت و شەیتان و شتی تر ئەپەرستن وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: **[وَمِنْ آیاتِهِ اللیلُ والنّهارُوَالشمسُ والقَمَرُ لا تسجُدُوا لِلشَّمسِ ولا لِلقَمَرِ و اسجُدُ وا للهِ الذی خَلَقَهُنَّ انْ کنْتُمْ ایاه تَعبَدون]**[1] واتە: لە نیشانەکانی تاك و تەنیایی خوایە: شەوو رۆژو خۆرو مانگ، چونکە هەر یەکەیان بە چەند بەرنامەیەکی قەشەنگ و رێك و پێك دامەزراون و کاری خۆیان دەکەن دەسا ئێوەش نە بۆ خۆر سوژدە بەرن، وە نە بۆ مانگ، چونکە ئەوانە هەردوو دروستکراوی خودان و، ئەوانیش سوژدە هەر بۆ ئەو دەبەن ئێوە سوژدە هەربۆ ئەو خودایە بەرن ئەوانی دروستکردووە ئەگەر دەتانەوێ بەهەقیانەت خودا بپەرستن.

٢. ئەوانەی خوا دەپەرستن بەڵام هاوبەشی (لە پیاوچاکان و پێغەمبەران) بۆ پەیدا دەکەن لە پەرستشدا، ئەم جۆرە کەسانە لە کاتی نارەحەتیدا بە تەنها داواییارمەتی لەخوا دەکەن، بەڵام لەکاتی خۆشیدا هاوەڵی بۆ پەیدا دەکەن،

---

([1]) - (فصلت/٣٧)

وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: [فاذا رَكبوافى الفُلكِ دعَوا اللهَ مُخلصينَ لَهُ الدّينَ فلّما نَجَّاهمُ الى البرِّ، اذا هُم يُشْرِكون][1]

واتە: لەکاتی خۆشیی و ئاسایشدا دەبینی ئەو خەڵکەیە بێ باوەڕن و نکوڵیی قیامەت دەکەن، کەچی کاتێ سواری کەشتی ئەبن و ترسی نقوم بوونیان لێ دەنیشێت زۆر بەکوڵ سەر دائەنێن و ملکەچیی و یەکلابوونەوەی خۆیان بۆ خوا دەرئەبڕن و تەنہا لەو داوا ئەکەن و، باسی بتەکان نامێنێ، بەڵام کاتێ ڕزگاریان دەکاو دەگەنە وشکانیی، دووبارە دەچنەوە سەر بیرە پووچەڵەکەی خۆیان و بەهەمان جۆر شەریك و هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن.

٣. هاناو هاوار بردن بۆ مردوویەك کە ڕزق دان و شیفای نییە، چونکە تەنہا خوای گەورە خۆی ڕۆزیدەرە (الرزاق) وە هەرخۆی شیفا دەرە (الشافی)، وە ئەو قسەیەش ڕاست نییە کە هەندێ کەس ئەم جۆرە کارانە ئەکەن ئەڵێن ئینجا ئێمە نایان پەرستین بەڵام دوعامان دەگەیەنینە ئەم مردووانەو تا ئەوانیش لای خوای گەورە تکامان بۆ بکەن دەیانکەینە نێوەندگیر، چونکە پاڕانەوە لەو مردووە خۆی بۆ خۆی عیبادەت کردنە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (الدُعاء هوَ العبادة)[2] وە عیبادەتیش پێویستە تەنہا بۆ خوا بێت وە نابێت نێوەندگیر دابنرێت لەنێوان خوای گەورەو پاشان خەڵکیدا، پێویستە تەنہا هاوار لە خوای گەورە بکرێت، چونکە خوای گەورە لە ئینسانەوە نزیکەو، وەڵامت دەداتەوە، وەکو دەفەرموێت:

(1) - (العنكبوت/٦٥)

(2) - (رواه الترمذيو قال حديث حسن صحيح)

[وقال ربُّكمُ ادعُونی اَسْتَجِبْ لَكُمْ][1] واتە: ئێوە لێم بپاڕێنەوەو داوام لێ بكەن وەڵامتان دەدەمەوە .

٤. حوكم كردن بە غەیری قورئان و بڕوا بوون بەوەی كە ئەم قورئانە بەكەڵك نایە بۆ چارەسەری كێشەكانی ژیان، ئەوا لە میللەتی ئیسلام دەردەچێ بەمە بێباوەڕ دەبێ، وەكو خوای گەورە دەفەرموێت: [ان الحُكمُ الا للّه أمرَ ان لاتعبُدوا الا ایّاهً ذلِك الدّینُ القیمُ ولكن أكثر الناس لایعلمون][2]

واتە: گشت حوكم و بڕیارێك تەنهاو تەنها هی خوایە, دەبێ تەنها ئەو حاكم و بڕیار بەدەست بێت فەرمانیداوە كە: ئێوە دەبێ تەنها ئەو بپەرستن و گوێرایەڵیی هەر لەوبكەن، نەك لەسەرۆك عەشیرەت، نەك لەگەل و نەتەوە، نەك لەوڵات و نیشتمان، نەك لە حیزب و گرووپ و خێڵ..هتد هەر ئەو ئایین و دینە ڕاست و ڕەواو پایەدارە، كە بانگتانم كرد بۆی، دەسا وریاو بەئاگابن وشوێنی بتان مەكەون بەڵام زۆربەی ئەو مەردمە نازانن ئایینی یەكخواپەرستی ڕاست و ڕێكە،وەك دەفەرموێت: [وَمنْ لَم یَحكُمْ بِما انزلَ اللهُ فَاولئِك هُمُ الكافرون ][3] واتە: هەر كەسێ حوكمبەقورئان نەكات ئەوا ئەو جۆرە كەسانە كافرن.

بەڵام ئەگەر حوكمی بە قورئان نەكردو بڕوای وابوو كە ئەم قورئانە بە كەڵك دێت بەڵام بە ئارەزوو یاخوود لە دەسەڵاتیا نەبوو ئەوا زاڵم و فاسقە بەڵام بێباوەڕ نییە،

---

(1) - (الغافر/٦٠)

(2) - (یوسف/٤٠)

(3) - (المائدة/44)

وەك ئیبن عەباس (خوای لێ رازی بێت) دەفەرموێت: **(من جَحد ما انزلَ الله فَقَدْ كفَرَ، وَمَنْ اَقَرّ بِه ِ فَهوَظالِمُو فاسِق]**، وە ابن جریریش هەر ئەم ڕایەی هەیە، وعطاء دەفەرموێت: **(كفر دونَ كُفر)**، واتە : كوفرێكی بچوكە.

٥. ڕازی نەبون بە حوکمی خوا یان پێ ی بێزار بێت ونەفسی ئاسودەنەبێ بە حوکمی ئیسلام: خوای گەورە دەفەرموویت: **[فلا وَربكَ لايُؤمِنونَ حتّى يُحَكِموك فِيما شجر بَيْنَهُم ثُمَ لاَ يَجدوا فى اَنْفُسِهِم حَرَجاً مِما قَضَيْتَ ويُسلموا تَسْليما]**[1] واتە: نەخێر(وانی یە كە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن) سوێند بە پەروەردگارت بڕوا دارنین تا تۆ نەكەنە دادوەر لەهەر ئاژاوە و دووبەرەكی یەكی نێوانیان دا لەپاشان هەست نەكەن لە دەرونیاندا بە هیچ بێزاری یەک لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل كەچ نەكەن بە مل كەچی یەكی تەواو. كەواتە: ئەگەر حوكمی قورئانیشت پەیڕەو كرد نابێت لە دڵەوە پێت ناخۆش بێت بەو حوكمە، یاخود ئەگەر ڕقی لەو حوكمە بێت كەخوا ناردوویەتی: خوای گەورە دەفەرمووێت: **[والذين كفروا فتعساً لَهُم واضَلَّ اعْمالَهُم ذلِكَ بانَّهُم كَرِهُوا ما أنزلَ الله فأحبَط أعْمالَهُم ]**[2] واتە: ئەوانەش كە بێ باوەڕیوون، خوا لەناویان دەبا كارەكانیشیان پووچەڵ ئەكاتەوە، واتە: پاداشیان لەسەر ناداتەوە،ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە بەڕاستی ئەوان رقیان لەوپەیامە دەبووەوە خوا دایبەزاندووە جا خوایش كارەكانیانی بێ ئاكام كردەوە. (حبوط) لە بنەڕەتا بریتیە لە ئاوسان و (با كردنی) سكی ئاژەڵ، بەهۆی جۆرە گیایەكەوە كە دەیخوات سەرەنجام ئەیكوژێ و تیا ئەچێ، هەر بەو شێوەیەش كاری بێ

---

(1) - (النساء/٦٥)

(2) - (محمد/٩٨)

بڕواكان زۆرو گەورە ئەبێ، تا دەرەنجام خوای گەورە پووچەڵی ئەكاتەوەو سوودی نامێنێ بۆیان.

**سێیەم: ئینكاری كردن لە سیفات یاخود ناوەكانی خوای گەورە یاخود تانە دان لێی:**

١. ئینكاری سیفەتی یاخود ناوی خوای گەورە بكات، كە لەقورئان و سوننەتی صەحیحدا هاتووە وەكو: (علم. قدرة. حیاة. سمع. بصر. كلام. رحمة. استواء. نزول . يد. عين . ساق) كە لە هیچ كەسێك ناچێت، خوای گەورە دەفەرموێت:**[لَيسَ كَمِثْلِهِ شيء وهو السّميعُ البصير]**[1]

واتە: هیچ شتێك نیە لەوێنەی ئەو (خوا)یە، نە لەزاتیا، نە لە سیفاتیا، نەلە كرداریا، بۆ خۆی تەنیایەو، لەهەموو شتێك، بێ نیازەو، هەمو شتێكیش نیازمەندە بەو ئەویشە بیسەری بینا، بەئاگایە بە وتەی بەندەكانی، بینایە بۆ كاروكردار یان.

٢. تەئویل كردنی هەندێك سیفەتی خوای گەورەو وەرگێردرانی لە ڕواڵەتەكەی وەكو ئەوەی (استواء) بكات بە (استيلاء) چونكە(استواء) واتە: بەرزو بڵند بوونەوە هەر وەكو بوخاری ڕاڤەی دەكات، چونكە ئەو كاتە (تعطيل)ی سیفەتێكی خوای كردووە، خوای گەورە دەفەرموێت:**[الرّحمنُ على العرشِ اسْتَوى]**[2] واتە: ئەو خوا بەخشندەیە بەرزبۆتەوە لەسەر عەرشی خۆی.

بەڵێ.. مەبەست بەم چوون و سەركەوتنەیە بۆسەر عەرش، بەرزبونەوەیەكە شیاوی زاتی بڵندی ئەو بێ و،

---

([1]) - (الشورى/١١)

([2]) - (طه/5)

بەو شێوەیە کە(سەلەف)و پێشینانمان تەفسیریان کردووەو، بێ هیچ شوبهاندن و لێکدانەوەو چوونە ناو قوڵاییەوە، جا بۆزیاتر بە ئاگابوون لەم بەرزبونەوەی سەر عەرشە، سەیری سوورەتەکانی: (ئەعراف) و (یونس) و (ڕەعد) بکە، وە ئەمە تەحریف کردنیشە، یەهودیەکان لە جیاتی (حطة) ووتیان (حنطة) ئەمانیش لە جیاتی (استواء)ئەڵێن (استولی) ..

٣. بڕوا بوون بەوەی کەوا کەسێکی تر غەیری خوا غەیب دەزانێ وەکو پیاوچاکان،خوای گەورە دەفەرموێت: **[قُلْ لا يَعْلَمُ مَنْ فی السمواتِ والارضِ الغَيْبَ اِلاّ الله]**[1] واتە: پێیان بڵێ: هیچ کەسێك لەوانەی کە لەئاسمانەکان و زەوییدان - بێجگە لە خوا- ئاگایان لەغەیب نیە و نازانن "و هەست ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوەو،کەیش پاداشت و تۆڵە دەدرێن ؟جا کەواتە هەر خوا- بەتەنیا- شایستەی پەرستن و گوێرایەڵییە،هەر ئەویش خۆی دەزانێ قیامەت کەی دێ؟. ئیمامی(موسلیم) لە خاتوو (عائیشە)وە خوای لێ رازی بێت ئەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: **(من زعم أن محمداً يعلم ما في غد؛ فقد أعظم على الله الفرية، والله تعالى يقول: (قل لا يعلم من فی السموات والارض الغيب إلا الله)**. واتە: هەر کەسێ پێی وابێ کە موحەممەد ﷺ دەزانێ سبەینێ چ دەبێ، ئەوە بە هەقیقەت درۆیەکی زۆر گەورەی لە سەر خوا هەڵبەستووە، چونکە خوا ئەفەرمووێ: بێجگە لە خودی(الله) کەس غەیب نازانێ.

---

(1) - (النمل/٦٥)

وە هەر کەسێك بانگەوازی بۆ بکات یاخود بڕوای پێ بکات ئیمانی هەڵدەوەشێتەوە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾فەرموویەتی:( من اتى كاهِناً او عر افاً فصّدقَهُ بِما يقولُ فَقد كَفرَ بِما أُنزِلَ على محمد)[1]

واتە: هەر کەسێك بچێتە لای هەرکەسێك ئەو فاڵچی و قاوەگرەوانەی کە ئەڵێن غەیب ئەزانین وە بڕوا بە قسەکانیان بکات ئەوە کافربووە بەو قورئانەی بۆ محمد ﴿ﷺ﴾ نێردراوە .

**چوارەم: ئینکاری کردنی یەکێك لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام ) یاخود تانەدان لێیان:**

١. ئینکاری کردنی پەیامی محمد﴿ﷺ﴾ چونکە شایەتی دانی بە پێغەمبەرایەتی ئەو لە ڕوکنەکانی ئیسلامە.

٢. تانەدان لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ یاخود لە ڕاستگۆیی و ئەمانەتی و پاکێتی، یاخود جوێندان پێی و گاڵتە پێ کردن بە خۆی یاخود بە سوننەتەکانی، تانە لێ دان لە فەرموودە صەحیحەکان و بە درۆ خستنەوەیان و نەفی کردنی ئەو هەواڵانەی کە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ داویەتی. هەواڵەکانی وەکوهاتنی (دەججال و عیساو.... هتد).

٣. بڕوا نەبون بە یەکێك لە پێغەمبەرانی پێش محمد ﴿ﷺ﴾ وەئینکاری کردنی بەسەرهاتیان لەگەڵ گەلەکانیاندا کە لە قورئان و فەرموودەی (صحيح) دا هاتووە .

---

(1) – صحيح رواه احمد.

٤. بانگەوازکردنی پێغەمبەرایەتی وەکو (احمد القادیانیە) کە دەیوت من پێغەمبەرم، خوای گەورە دەفەرموێ: **[ما كانَ مُحمّد أبا أحدٍ مِن رِجالِكُم ولكِنْ رَسُولَ الله وخاتَمَ النّبيّن]**[1]

واتە: محمد﴿ﷺ﴾ باوکی هیچ پیاوێك لە ئێوە نییە بەڵام نێردراوێکی خوایە و وە دوواهەمینی پێغەمبەرانە.

وە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾فەرموویەتی:**(و انا العاقِبُ الذى ليسَ بعده نبى)**[2]

واتە:من کۆتاییم و پێغەمبەرم لە دواوە نیە، وە هەرکەس باوەڕی وابێت کە دوای محمد﴿ﷺ﴾ پێغەمبەری تازە دێت، ئەوە کافر دەبێت.

٥. وەسف کردنی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾بە وەسفێك کە تەنها خوای گەورە ئەو وەسفەی هەبێت، وەکوزانینی غەیب.

٦. داوا کردنێك کە تەنها لە توانای خوای گەورەدایە وەکو داوای سەرخستن و یارمەتی و شیفا و شتی تر کە ئەمەش شیرکی گەورەیە، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت: **( وَاذا سَالْتَفآسالِ الله، واذا آسْتَعَنْت فاسْتَعِن بالله)**[3]

٧. ئێمە بڕوامان بە موعجیزاتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾و کەراماتی پیاوچاکان هەیە، بەڵام نایان کەینە هاوبەش بۆ خوای گەورەو پاشان هاواریان لێ ناکەین و سەربڕین و نەزریان بۆ ناکەین و پارە بە هەدەر نادەین بۆ ئەوکەسانەی لەسەر حسابی خەڵکی دەژین بە بۆنەی گۆڕێکەوە ئەو خەڵکەیان خڕکردۆتەوەو بازاڕی خۆیانیان پێ گەرم کردووە.

---

(1) - (الاحزاب/٤٠)

(2) - (متفق عليه)

(3)(رواه الترمذى و قال حسن صحيح)

## پرسیاری سی و سێ

**بەکێ دەوترێت(کافر)بێباوەڕ؟ وە حوکمی بێباوەڕ چییە لەدوواڕۆژدا؟**

**وەڵامی پرسیاری سی و سێ:**

بنچینەی کوفر لە **(كَفَرَ)** هاتووە کە بە مانای شاردنەوە دێت، واتە: ئەو کەسانەی کەهەقیقەتی ئیسلام دەشارنەوە، وە دەشکرێن بە دوو جۆر کە بریتین لە:

**یەکەم: کوفری هەرە گەورە (الكفرالأكبر).**

**دووەم: کوفری هەرە بچووك (الكفر الأصغر).**

**یەکەم: کوفری گەورە و جۆرەکانی** ئەو کوفرەیە کە بە ئەنجامدانی خاوەنەکەی پێی لە ئاینی ئیسلام دەردەچێت، جۆرەکانیشی بریتین لە:

* **کوفری بە درۆخستن (كفر التكذيب):** واتە بە درۆخستنەوەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: **[وَمَنْ أظْلَمُ مِمَّنْ إفْتَرَى على اللهِ كَذِباً أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمّا جَاءَهُ][1]** واتە: کێ لەو کەسە زۆردارترە کە بە درۆ بوختان بە خوا هەڵ دەبەستێ و دینی خوا بە درۆ بخاتەوە دوای ئەوەی کە بۆیان هات؟.

---

(1) - [العنكبوت/ ٦٨]

* **کوفری خۆ بە گەورە زانین (الإباء والإستكبار)**: وەکو ئەو کوفرەی کە ئیبلیسی نەگریس، شەیتان کردی، هەروەك قورئان دەفەرمووێت: **[وإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى واسْتَكْبَرَ وكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ]**[1] واتە: بە فریشتەکانمان ووت: کە سووژدەی ڕێز بۆ ئادەم ببەن، ئەوانیش سووژدەیان برد، تەنها ئیبلیس نەبێ خۆی بە گەورە زانی و کافر بوو.

* **کوفری گومان بردن بە ڕۆژی دوایی (كفر الشك بيوم القيامه)** : هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: **[يَسْئَلُ أَيَّانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ]**[2] واتە: بێ بڕواکان بە گاڵتەوە دەیان ووت: کەی ڕۆژی دوایی دادێ ئەگەر ڕاست دەکەن؟ واتە گومانیان لە هاتنی ڕۆژی دوایی هەبوو!.

* **کوفری پشت گوێ خستن (كفر الإعراض) لە وەرگرتنی ئیسلام**: هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: **[وَالَّذِينَ كَفرُوا عَمَّا أُنْذِرُوا مُعْرِضُونَ]**[3]

واتە: کافر و بێ بڕواکان کەللە ڕەقن بەو ترسەی کە لە قورئان دەیاندرێتێ.

* **کوفری دووڕوویی (كفر النفاق)**: نیفاق واتە بە زمان خۆت بە مسوڵمان دابنێیت و لە دڵەوەش دژی ئایینی ئیسلام بیت، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: **[ذَلِك بِأَنهَمْ آمَنوا ثُمَّ كَفرُوا فَطُبِعَ علَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لاَ يَفْقَهُونَ]**[4] واتە: لە بەر ئەوەی ئەوان باوەڕیان هێناو پاشان کافر بوون ئینجا ئێمەش مۆری خۆمان بە دڵیانە وەنا بێ ئەوەی کە هەست بکەن.

---

(1) –[البقره/ ٣٤]

(2) - [القيامه/ ٦]

(3) - [الاحقاف/ ٣]

(4) - [المنافقون/ ٣]

* **کوفری دڵ ڕەق (کفر الجحود):** ئەمە ئەو کوفرەیە کە دان نەنێیت بە ڕوکنەکانی ئیسلام و ئیمان. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: [وَمَا يَجْحَدُ بِآياتِنا إلاَّ الْكَافِرُونَ][1] واتە: هیچ کەس بە ئایەتەکانی ئێمە دڵ ڕەق نیە تەنها کافرەکان نەبێ.

**دووەم: کوفری بچووك و جۆرەکانی**

کوفری بچووك ئەو کوفرەیە کە بە ئەنجامدانی پێی لە ئیسلام دەرناچیت، جۆرەکانی بریتین لە:

* **کوفر بە نیعمەتەکانی خوا (کفر النعمة):** بچووکترین نیعمەت شوکری لە سەر پێویستە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: [وإذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُم لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ، ولِئِنْ كَفرْتُمْ إنَّ عَذابِي لَشَدِيدٌ][2]

واتە: پەروەردگاری ئێوە بانگی ڕاهێشتووە کە ئەگەر شوکری نیعمەتەکانی خوا بکەن، ئەوا خوا نیعمەتەکانتان بۆ زیاد دەکات، بە ڵام ئەگەر کوفری لە سەر بکەن ئەو دەمە سزای خوا زۆر توند و تیژە بۆ ئەو کەسە.

* **کوفری ڕەفتار (الکفر العملی):** بریتیە لە هەر کارێك کە پێی یاخی بیت، وەکو جوێن دان یان شەڕکردن لەگەڵ برواداران یان زینا کردن یان ئارەق خواردنەوە...هتد. ئەم جۆرە کوفرە پێی لەئیسلام دەرناچیت، چونکە کوفری

(1) – [العنكبوت/٤٧]
(2) -[ابراهيم/٧]

بیروباوەڕ (إعتقاد) نیيه، هەروەك پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێ:
**(سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وقِتَالُهُ كُفْرٌ)**[1]

واته:جوێن دان به مسوڵمانان له ئايين دەرچوونه و شەڕكردنيش لەگەڵيان كافربوونه.

یان دەفەرمووێ: **(لاَ يَزْنِي الزَّ انِي حِينَ يَزْنِي وهُوَ مُؤْمِنْ...)**[2]

واته: زيناكەر له كاتی زيناكەيدا بڕوادار نییه.

*** ئەو فەرمانڕەوایەی که لەبەرهەواو ئارەزووی حوکم به قورئان ناکات:**

ئەمەیان ئەو کەسەیە کە دان بە قورئان بێنێت ومسوڵمان بێت، بە ڵام لە بەر چەند بەرژەوەندییەك حوكمی پێ ناكات، واته له بەر ڕقەبەرایەتی نەبێ وەك دەسەڵات دارەکانی ئەمڕۆ کەوازیان لەحوکمی خوا هێناوەو دژایەتیشی دەکەن، کەوایە هەر کەس دژایەتی بەرنامەی خوا بکات، باناوی له خۆشی نابێت مسوڵمان ئەوا کافر دەبێ و له ئايينی ئیسلام دەردەچێت.

حوکمی کوفری گەورەش دوای دەرچونیانە لەبازنەی ئیسلام چونکە کوفری موغەلەزەیە، که بریتییە لەوە لەگەڵ کوفرەکەیان شەڕ لەگەڵ مسوڵمانان ئەکەن و مزگەوت دەڕووخێنن و دژایەتی ئیسلام و مسوڵمانان دەکەن.. هتد.

ئەمانە لەگەڵ ئەوەی لەدونیاشدا خەسارەت مەندن، لە قیامەتیش بە نەمری لە دۆزەخدان ئەگەر پێش مردن تەوبە نەکەن و نەگەڕێنەوە سەر ئەسڵی دینەکەیان.

---

(1)(رواه البخاری)

(2) - (رواه مسلم)

بەڵام کوفری بچووك ئەوە تەعزیر و تەئدیب دەکرێن، واتە تەریق دەکرێنەوەو ئەشکێنرێنەوە، ئەویش دوای ئامۆژگاری کردنیان ئەگەر نەگەڕانەوە، لە قیامەتیش دەکەونە ژێر مەشیئەتی خوا، یا لێیان خۆش ئەبێ یان سزایان ئەدات، هەڵبەتە ئەو حاکم و پێشەوایەی کە ئەم کوفرەی تێدابووە لەمێژووی دەسەڵاتی ئیسلامی دا بونی هەبووەو ،کەجاری واهەبووە والی یەك یان دەسەڵات دارێك زوڵم و ستەمی کردوە لەبەر بەرژەوەندی و هەواو ئارەزووی خۆی لەهەندێ حوکم دا زوڵم و ستەمی کردووەو بەڵام خۆشی بەتاوانبار زانیوەو زانیویەتی کە کارەکەی هەڵەیە، وەلەگەڵ ئەوەشدا هەر حوکمی بەشەرعی خوا کردووەو هیچ کاتێك پێی وانەبووە یاساو دەستورێك لەحوکمی شەرعی خوا باشترە.

## پرسیاری سی و چوار

**بە کێ دەوترێت هەڵگەڕاوە(المرتد)؟**

### وەڵامی پرسیاری سی و چوار:

پێناسەی پاشگەزبوون(تعریف الردة): بەکورتی بریتییە لە پەشیمان بوونەوەو پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام دووای مسوڵمان بوون، ئەویش بە نکوڵی کردن لەشتێك یاهەموو شتە ئاشکراکانی ئیسلام،جائەو شتە ئاشکرایە چ لە لای خواوە دابەزیبێ یالای پێغەمبەری ئیسلام محمد(ﷺ)باسکرابێت،یاخود جێگیرکردنی ئەوشتانەی کەخواو پێغەمبەر(ﷺ)نەفی کردوون و بەر هەڵستی لێیان کردووە، شێوازی پاشگەزبوونەکەش چ بەڕەفتار بێت وەك تەرك کردنی،چ بە گوفتاربێت وەك قسە پێکردنی،یان عەقیدەیی بێت وەك گومان پێ بردنی..هتد.

یاچاکتر بڵێین: بریتییە لە ئەنجام دانی کارێك لەوکارانەی کە ئیسلام هەڵدەوەشێنێتەوە.

ئیمامی کاسانی بەڕەحمەت بێت لە کتێبی(بدائع الصنائع)دا دەفەرموویێت: ڕیددەو پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام ووتنی قسەیەکی کوفرە دوای هەبوونی ئیمان و باوەڕ لەدڵ و دەروونی ئەوکەسە،چونکە پاشگەزبوونەوە بریتییە لە هەڵگەڕانەوە بەسەر ئیمان).

ئیمامی(صاوي مالیکی)بەڕەحمەت بێت لە کتێبی(الشرح الصغیر) دا دەفەرموویێت: (پاشگەز بونەوە بریتی یە لە بڕ باوەڕبونەوەی مسوڵمان بەکوفرێکی ئاشکرا کە لەدەمی یەوە دەرئەچێت،یان کردەوەیەکە کوفری لێ ئەپشکوێتەوە).

هەروەها ئیمامی شەربینی شافعی لە کتێبی (مغنی المحتاج)دا دەفەرمووێت: (پاشگەزبوونەوە بریتی یە لە دابڕان لە ئیسلام،جاچ بە نیازو نیەتەوە بێت یاخود بەکردەوەبێت،یابەگاڵتەوە بێت یاخود بەکەللە ڕەقی و دڵ و دەروونییەوە بێت).

هەروەها بەهوتی حەنبەلی بەڕەحمەت بێت لە کتێبی(کشاف القناع) دا دەفەرمووێت: (پاشگەز بوونەوە بریتی یە لە کوفرێك کە بەزمانی ئەنجامی ئەدات،یاخود لەدڵەوە ئەیدات،یان گومانێکە بەئیسلامی ئەیبات،یابەکردەوە کارێکی کوفری لێ ئاشکرا ئەبێت).

دیارە ئەم باسە زۆر زیاتری پێویستە لەسەری بدوێین بەڵام بەکورتی مورتەد ئەو کەسەیە کە لە دینی خوا پاشگەز بووبێتەوە، یان ئەوەیە خۆی بەمسوڵمان بزانێت و بەڵام پشتگیری بێباوەڕان بکات لە دژایەتی کردنی ئیسلام و مسوڵمانان‌دا.

## پرسیاری سی و پێنج

**بەکێ دەوترێت (المنافق) دووڕوو؟**

### وەڵامی پرسیاری سی و پێنج:

موونافیق، واتە دووڕوو لە ئەسڵی لە نەفەقەوە هاتووە، واتە ئەو کەسەی لەژێرەوە خیلافی دەرەوەیەتی، لە دڵا ڕقی لە ئیسلام و مسوڵمانانە، بەڵام لە سەرەوە لەگەڵ مسوڵمانانە، ڕونتر بڵێین بەدڵ بێباوەڕەو بەزمان باوەڕدار.

جۆرەکانیشی دووجۆرە:

**یەکەم : نیفاقی بیروباوەڕ(نفاق الأكبر):** ئەم جۆرە نیفاقە مرۆڤ لە دین و ئوممەت دەباتە دەرەوە و خاوەنەکەی لە ژێرەوەی ئاگردا دەبێت وەك خوای گەورە دەفەرمووێت:[إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ][1] واتە: دیارە کە دووڕووەکان لەچینی هەرە خواری ئاگری دۆزەخدان.

موونافیق ئەوکەسەیە کەبەشاراوەیی پەیامی پێغەمبەر(ﷺ)کەدینی خوایە بەدرۆدەخاتەوە وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: [ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ)يُخَادِعُونَ اللّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم وَمَا يَشْعُرُونَ) فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللّهُ مَرَضاً وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ][2] واتە: لەنێو خەڵکیدا کەسانێك هەن دەڵێن: باوەڕمان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە کەچی درۆ دەکەن و، لەڕاستییدا بڕوایان نییە، بەڵکو دەیانەوێ ئێوە فریو بدەن و، وردە وردە لێتان نزیك ببنەوەو، لە دژتان پیلان بگێڕن و، پشێوی بخەنە ناوتانەوەو ڕیزەکانتان تێك

---

(1) - [النساء/١٤٥]

(2) - [البقرة/٨-١٠]

بدەن، ئەوانە بەنیازی خۆیان دەیانەوێ فێڵ و تەڵەکە لەگەڵ خوداو ئەوکەسانەدا بکەن کە بڕوایان هێناوە بەڵام لەڕاستییدا تەنها لەگەڵ خۆیان فێڵ وفەرەج ئەکەن و زیانەکەشی هەر بۆ خۆیان ئەگەڕێتەوەو تەنها خۆیان دەخەڵەتێنن لە حاڵێکدا هەستیش بەو ڕاستییە ناکەن! دیارە هۆی بێ هەستیشیان هەر ئەمەیە کە دڵیان دەردو نەخۆشیی و حەسوودیی و گومان و ناپاکیی تێدایە جاخوایش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەردو نەخۆشییەکەیانی زیاد کردن، جگە لەوەیش سزایەکی سەخت و ئێش پێگەیەنەریان بۆهەیە لەبەر ئەوە کەدرۆیان کرد، بەتایبەت ئەو دەمەی کە دەیانگوت بڕوامان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە.

**ڕێنمایی ئایەتەکانی (١٠,٩,٨)ی سورەتی بەقەرە:**

١. خۆپاراستن لەدرۆوکاری دووڕوویی و فرت وفێڵ، دیارە کە ئەنجامی ئەو کارانەش هەر لەسەر خاوەنەکەی دەشکێتەوە.

٢. (المنافق) و دووڕوو کەسانێکن کە بەزمان ئیمان ئاشکرا دەکەن و، کوفرو بێ بڕوایی لەدڵ و دەروونیاندا دەشارنەوە.

(ئیبن عەباس) -خوای لێ ڕازی بێ - دەڵێ: دوو ڕووەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾(٣٥٠) پیاوو (١٧٠) ژن بوون، ئەوانیش پێکهاتبوون لە کەسانێکی هۆزی (ئەوس) و (خەزرەج) و جوولەکە، هاوڕێ لەگەڵ سەرۆکی دووڕووە موشریکەکانیش: کە ناوی (عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول) بوو.

**لەجۆرەکانی نیفاقی گەورەش بریتین لە:**

* بە درۆخستنی پێغەمبەر ﷺ و ئەو هەواڵانەی کە باسی کردوون.

* بوغزاندنی پێغەمبەر ﷺ و ئەو شتانەی کە باسی کردوون.

* دڵ خۆش بوون بە شکستی ئیسلام و مسوڵمانان و ڕق هە ڵسان بە سەرکەوتنی ئیسلام و مسوڵمانان.

**دووەم: نیفاقی کردەوە (نفاق الأصغر):** ئەمیان خاوەنەکەی سیفەتێکی مونافیقانی هەڵگرتوە بەڵکو بە ئەنجام دانی هەر کردەوەیەکی دووڕوان کە بریتییە لە خیلافی بەڵێن و درۆکردن و خیانەت لە ئەمانەت و.. هتد وەك لەوفەرموودەیەدا هاتوە کەپێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: **(آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ : إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ)**[1] واتە: نیشانەکانی دووڕوو سێیە: کاتێك کە قسە دەکات درۆ دەکات، کاتێك کە بەڵێن دەدا بەڵێنەکە ناباتە سەر، کاتێك کە ڕاسپاردەی لا دانرا خیانەتی تێدا دەکات. بە لام ئەگەر بەحەلاڵیان بزانێت ئەوە هەم سیفەتی کوفری ئەکەوێتە سەر، وە هەم ئەبێتە مونافیقی گەورە حوکمەکەشی لەدووارۆژدا ئەوەیە کەوا لە ژێرەوە ژێرەوەی دۆزەخ دا بە هەمیشەیی دەسوتێنرێت..

**هەندێک لە سیفاتی دووڕوان خوا بمان پارێزێت لەم کردەو انە:**

وەك خیلافی بەڵێن و درۆکردن و خیانەت لە ئەمانەت و تەمبەڵی کردن لە عیبادەت دا و ڕوپامایی لە عیبادەت دا و بەپەلە نوێژکردن و کەم یادی خواکردن و تانەو تەشەرگرتنە مسوڵمانان و گاڵتە کردن بەقورئان و سوننەت

[1] - (رواه البخاري (٣٣) ومسلم(٥٩)

و سوێند خواردن بەدرۆ و ماڵ بەخشین بەزۆر و سەرشۆڕکردنی مسوڵمانان وڕووداو گەورەکردن و ڕەخنە گرتن لەقەدەری خوا و بەخراپ باس کردن و زمان لێدان لە پیاو چاکان و دواکەوتن لە نوێژی جەماعەت و بڵاو کردنەوەی خراپەکاری بە ناوی ئەوەی چاکە بڵاو دەکاتەوە و ناوەوە و دەرەوەی وەك نەبێت و ترسان لە ڕودانی شت و عوزر هێنانەوە بەدرۆ و فەرمان کردن بە خراپەو قەدەغەکردنی چاکە و پیسکەیی و رەزیلی و خوا لە بیر چون و بەدرۆ خستنەوەی بەڵێنی خوای گەورە پاشان پێغەمبەرەکەی و گرنگی دان بە ڕووکەش و فەرامۆش کردنی ناوەڕۆك وشارەزا نەبوون لە دین و دڵ خۆش بوون بە هاتنی بەڵاو ناخۆشی بەسەر بڕواداران و غەم و پەژارە دەربڕین بە خۆشی ئیمانداران و زمان لوسی و زۆر ڕەویی و زۆر بلێیی و شەرم کردن لە خەڵك و لەخوا شەرم نەکردن و لە کاتی ناکۆکی دا لەگەڵ براو خوشکە مسوڵمانەکەی قسەی ناشرین و زیادە ڕەوی زۆر دەکات و تۆمەت و بوختان بڵاو دەکاتەوە و چەندین خاڵی دیکە هەن کە دەبێت خۆمانی لێ بپارێزین.

## پرسیاری سی و شەش

**پێناسەی (جاهل) نەزان چییە؟**

### وەڵامی پرسیاری سی و شەش:

بەکورتی **جاهل**: واتە نەزان

وە هەروەها جەهل لە ڕووی زمانەوانییەوە: بریتییە لە بە خیلاف تێگەیشتن لە شتێك، وەك کەسێك پەرداخێك شیر ئەبینێ وا ئەزانێ دۆیە!! کورد ئەڵێ بە شیر دەمی سووتاوە فوو لە دۆ ئەکات!!!

لە ڕووی شەرعیشەوە واتە بێ ئاگا لە هەقیقەتەکانی ئیسلام، بۆیە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾دەیفەرموو: **(اللهم أرنا الحق حقاً وارزقنا اتباعه، وأرنا الباطل باطلاً وارزقنا اجتنابه)**

بۆ تێگەشتنی زیاتر لە مانای جاهل دەتوانین بڵێین بە واتایەکی گشتی واتە: نەزان بێ ئاگابوون لە شتێك بەڵام دەکرێت کەسێکی جاهیل واتە نەزان نەزانیەکەی نەمێنێ ئەگەر هاتوو خوێندی و بەدوودادا چوونی کرد، بە کورتیەکەی بۆ هەریەك لەو ووشانە زۆر شت هەن لەسەریان کە دەتوانین نموونە بهێنینەوە بەڵام ئەوەندە بەسە بۆ تێگەشتن لە واتای جاهیل.

## پرسیاری سی و حەوت

**پێناسەی (فاسق) لە سنوور دەرچوو چییە؟**

### وەڵامی پرسیاری سی و حەوت:

بەکورتی **(فاسق)**: واتە تاوان کارو لە سنور دەرچوو.

**(فاسق)**: واتە دەرچوون لە گوێڕایەڵی خوای گەورە وە بەو کەسە دەوترێت کە تاوان دەکات، بەڵام ئەمەش شیکاری زۆر زۆری تێدایە فاسقی وا هەیە لە ئیسلام پێی دەچێتە دەرەوە وە هەشە هەر پێی تاوانبار دەبێت بەپشتیوانی خوای گەورە هەندێکییان باس لێوە دەکەین.

وەهەروەها**(فاسق)** لەبنچینەدا لە (فسق)وە هاتوە، لەبنەڕەتدا ئەگەر دەنکی خورما لەتوێکڵی خۆی دەرچوو پێی دەڵێن (فسق)، کەواتە بەوکەسە دەڵێن: (فاسق) کە لە فەرمانی خوا دەرچووبێت.

زانایانیش زۆرتەفسیریان هەیە لە سەر ووشەی (فسق)بۆنموونە:

ئیمامی (القرطبي) دەفەرمووێ: (فسق) واتە: دەرچوون لە گوێڕایەڵی (إطاعة) خوای گەورە.

وە ئیمامی(البیضاوي) دەفەرمووێ: (الفاسق) واتە: دەرچوو لە فەرمانی خوای گەورە.

وەئیمامی(الراغب الاصفهاني) دەفەرمووێ: (فسوق) بریتییە لە (ئەنجام دانی گوناه چ کەم بێ چ زۆر).

**جۆرەکانی (فسق)**

(فسق) دەکرێتە دوو بەش کە بریتین لە:

**یەکەم: ئەو فسقەی کە پێی لە ئیسلام دەردەچیت.**

**دووەم: ئەو فسقەی کە پێی لە ئیسلام دەرناچیت.**

(ابن عباس) ڕەزای خوایان لێبێت دەفەرمووێت: هەر ناوێك کە خوا بۆ غەیری مسوڵمانی بەکار بهێنێ وەکو (خاسر، مسرف، ظالم، فاسق) هەموویان بەمانای (کفر) دێن، واتە: بە (کافر) لە قەڵەم دەدرێن، بە لاّم ئەو ناوانەی پێشوو کە خوا بۆ مسوڵمانان بەکاری بهێنێ ئەوا بەمانای (فاسق) دێن و بە گوناهبار لە قە ڵەم دەدرێن.

**فسقی بێ بڕوا یان دەکرێت بە دوو بەش:**

* **(فسق)ی بیروباوەڕی:** وەکو (فسق)ی دووڕووەکان. هەروەك خوای گەورە **دەفەرموێ: [إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمْ الفَاسِقُونَ]**[1] واتە: بەڕاستی دووڕووەکان لە ئایین دەرچوو ون.

* **(فسق)ی ڕەفتاری:** وەکو (فسق)ی (ئیبلیس) نەفرەتی خوای لێبێت و پە نا دەگرین بەخوا لە شەڕو ئاشوبی هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ:

**[وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لأِدَمْ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الجِنّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِرَبِّهِ...]**[2]

---

([1]) - [التوبه/ ٦٧]

([2])[الكهف/ ٥٠]

واتە: ئێمە بە فریشتەکانمان ووت: کەوا سوژدە بۆ ئادەم بەرن هەموویان سوژدەیان برد، تەنها ئیبلیس (شەیتان) نەبێ کە لە ڕەگەزی جنۆکەکانە لە فەرمانی خوا دەرچوو (سوژدەی بۆ ئادەم نەبرد).

لە قورئاندا لە زۆربەی ئایەتەکاندا ووشەی (فسق) بۆ کافر و بێ بڕوایان بەکار هێنراوە: بۆ نموونە: خوای گەورە دەفەرموویت: [وَلَقَدْ أَنْزَلْنَا اِلَيْكَ آياتٍ بَيِّنَاتٍ ومَا يَكْفُرُ بِهَا إلاَّ الفَاسِقُونَ][1] واتە: بێگومان ئێمە ئایەت و نیشانەی ڕوونی خۆمان بەسەر تۆدا ناردۆتە خوارەوە، بە لام هیچ کەسێك پێی ناڕازی نەبوو تەنها فاسقەکان نەبن.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموویت: [إِنَّ المُنَافِقِينَ هُمُ الفَاسِقُونَ][2]

واتە: بێگومان دووڕووەکان بۆ خۆیان (فاسق)ن.

پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێ:

(فَالمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِي، وصَدَّقُوا بِي، والفَاسِقُونَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِي وجَحَدُوا بِي)[3] واتە: بڕواداران ئەو کەسانەن کە باوەڕیان پێ هێناوم (بەڕاستم دەزانن)، بەڵام (فاسق)ەکان ئەوانەن کە بەدرۆم دەزانن و دڵ ڕەقن بەرامبەر بەمن.

**بەڵام ئەو جۆرە (فاسق)انەی کە پێی لە ئیسلام دەرنەچوون بریتین لە دوو بەش:**

---

(1) - [البقره/ ٩٩]

(2) - [التوبه/ ٦٧]

(3) - (ابن عاصم، طبراني)

**یەکەم: (فسق)ی بیروباوەڕی:** هەروەك (ابن القیم) ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ: ئەم جۆرە کەسانە ئەوانەن کە: خاوەن (بدعه) ن ئەگەرچی بڕوایان بە خوا و پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هێناوە و حەرام بە حە رام دەزانن و حەڵاڵ بە حەڵاڵ دەزانن، بەڵام بەنەفامی بەدوای ئیسلام کەوتوون یان بە کوێری بە دوای هەڵەی زانایان کەوتوون، وەکو (خەوارج و رافیزی و قەدەری و موعتەزیلی و جەهمی...) یەکان.

هەروەها (فسق) گشتی ترە لە (بیدعه) هەروەك (ابن صلاح) دەفەرمووێ: **(كُلُّ مُبْتَدِعٍ فَاسِقٌ، ولَيْسَتْ كُلُّ فَاسِقٍ مُبْتَدِعاً)**[1] واتە: هەموو خاوەن بیدعەیەك (فاسقه) بەڵام هەموو فاسقێك خاوەن بیدعە نییە.

**دووەم: (فیسقی ڕەفتار):** ئیمامی (نووی) ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ: **(وَأَمَا الفِسْقُ فَيحْصَلُ بِارْتِكَابِ الكَبِيرَةِ، أَوْ الإِصْرَار عَلَى الصَّغِيرَةِ)**[2] واتە:(فسق) بریتییە لە ئەنجام دانی گوناهی گەورە و سوور بوون لەسەر گوناهی بچووك.

**ئەم جۆرە (فسق)هش چەند بەشێك دەگرێتە خۆ، بۆ نموونە:**

* **درۆکردن:** وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: **[يَآ أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمَاً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَافَعَلْتُمْ نَادِمِينَ]**[3]

---

(1) - (فتاوی ابن صلاح لاپەڕە ٢٨).

(2) - (فتاوی النووی ص ٢٣٦).

(3) - [الحجرات/ ٦]

واتە: ئەی بڕوادارینە، ئەگەر پیاوێکی فاسق و خراپ هەواڵێکی بۆ هێنان ڕوونی بکەنەوە چونکە ناخۆشە لەسەر قسەو هەواڵی ئەو پیاوە خراپە کۆمەڵێ دووچاری سزا و نارەحەتی بکەن (لە پاشان کە هەواڵەکە درۆ دەرچوو بەداخ و مەراقەوە) پەشیمان ئەبنەوە. لێرەدا فاسق بەمانای (کاذب) هاتووە.

* **جوێندان:** هەروەك پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرمووێ: **(سِبَابُ المُسْلِمِ فُسُوقٌ)**[1] واتە: جوێن دان بە مسوڵمان لە ئایین دەرچوونە.

* **بوختان:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: **[وَالَّذِينَ يَرْمُونَ المُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً ولاَتَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وأُولئِكَ هُمُ الفَاسِقُونَ]**[2] واتە: ئەوانەی بوختان بە ژنی پەرژین کراو (داوێن پاك) دەکەن و پاشان چوار شایەدیان نەهێنا ئەوا هەشتا داریان لێبدەن و بە شایەدیان وەرمەگرن، چونکە بەڕاستی ئەوانەفاسقن.

* **ناوو ناتۆرە لەیەکترنان:** هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: **[وَلاَتَنَابَزُوا بِالالْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الفُسُوقُ بَعْدَ الإيْمَانِ]**[3]

واتە: بانگی یەکتر مەکەن بە ناوی ناشرین و خراپ، چونکە لە دووای باوەڕ زۆر ناشرین و خراپە ناوبانگی گوناهو تاوان بکەوێتە شوێنێ.

زۆری تریش هەن کەوا بە (فسق)ی ڕەفتار دادەنرێن، وەکو: (دزی، دووڕوویی بچوك، کوفری نیعمەت).

---

(1) - (رواه البخاري).

(2) - [النور/ ٤].

(3) - [الحجرات/١١]

## پرسیاری سی و هەشت

**باسی ئەم کۆمەڵانە و سیفەتەکانییان بکە؟**

**{(خەواریج)(مورجیئە)(جەهمیە)(موعتەزیلە)(موشەبیهە)(موجەسەمە)(سۆفیگەری)(جەبری)(قەدەری)(ئەشعەری)(ماتۆریدی)(ئەهلی کەلام)(ئەهلی سونەو جەماعە)(کۆمەڵی سەرکەوتوو (الطائفة المنصورة)(سەلەفی) (وەهابی) کێن و سیفاتیان چییە)؟.**

### وەڵامی پرسیاری سی و هەشت:

**یەکەم: (خەواریج).**

خەواریج: یەکەم تاقم بوون کە لە مێژووی ئیسلامدا پەیا بوون و لەسەر پێشەوای بڕوادارن عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێت) دەرچوون و هەندێ لە هاوەڵانیان کافر کرد، ژمارەیان دوانزە هەزار کەس بوو لەناو خۆیاندا عبداللّٰەی کوڕی وەهەبی راسبی یان هەڵبژارد بۆ سەرکردایەتی یان، دواتر ئیمامی علی کوڕی أبوطالیب(خوا لێی ڕازی بێت)عبداللّٰەی کوڕی عباسی ناردە لایان(خوا لێیان ڕازی بێت) تاوەکو فیتنەکەیان گەورەتر نەبێت ئەویش پاش مانەوەی بە سێ ڕۆژ توانی قەناعەت بە نیوەیان بکات و بیان گێڕیتەوە ژێر ڕکێفی خەلیفە پاشان ئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازیبێت) جوابی بۆناردن و پێی فەرموون: (**ئێوە بەڕێی خۆتان و ئێمەش بەڕێی خۆمان،بەمەرجێك خوێنی کەس بەناحەق نەڕێژن و ڕێگەی کەس نەگرن وزوڵمیش لەکەس نەکەن،و ئێمەش ڕێگەی ماڵی خواتان لێ ناگرین و شەڕیشتان لەگەڵ ناکەین تا ئێوە شەڕمان لەگەڵ نەکەن**) بەڵام دواتر کەوتنە خوێن ڕشتن و خوێنی هاوەڵێکی بەڕێزو خێزانەکەیان ڕشت بە ناحەق ئیمامی علی(خوا لێی ڕازی بێت) هێزیکی

کۆکردەوە بۆیان چوو تاوەکو تەمێیان بکات ئەوانیش لە نەهرەوان کۆبوونەوەو پاش گەمارۆدانیان ئەبو ئەیوبی ئەنساری (خوا لێی ڕازی بێت)ئاڵایەکی هەڵکرد و فەرمووی هەرکەس بێتە ژێر ئەم ئاڵایە ئازادە بۆ کوێ دەچێت ئێمە تەنها بۆ ئەوکەسانە هاتوین کەدەستیان هەیە لە خوێنی عبداللە ی کوڕی خەبابی کووڕی ئەرەت و خێزانەکەیدا(خوا لێیان ڕازی بێت) بەوشێوەیە کۆمەڵێکی تر هاتنە ژێر ئاڵاکەو ئەوی کەمایەوە ژمارەیان هەزار کەسێک دەبوو لەگەڵ سەرکردەکەیان دا وەپاشان شەڕ دەستی پێکرد هەرزوو خەواریجەکان شکان و سەرکردەکەشییان کوژرا و لە پاش خۆشییان تە نییا سێ کەس مانەوە دواتر ئەوانیش کوژران و کەسی تر نەمایەوە.

بیرو باوەڕیان وایە کە درووستە لەسەر ئەو پێشەوا مسوڵمانانە ڕاپەڕن کە ستەم و فیسقیان لێ پشکواوە و دەرکەوتوە، وە مسوڵمان بەتاوانی گەورە کافر ئەکەن و دەڵێن: بە نەمریش لە ئاگری دۆزەخ ئەمێنێتەوە، هەروەها باوەڕیان بە شەفاعەتیش نییە.

سەبارەت بە حوکمی خەواریجیش: شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە"بەڕەحمەت بێت" دەفەرمووێت: زانایان تێکڕا کۆکن لە سەر خراپەکاری و گومڕا بوونی خەواریج، هەر چەند یەکدەنگ نیین لەسەر کافر کردنییان، بگرە دوو ڕای جیاواز لەسەر ئەم تاقمە گوتراوە، ئەویش مەزهەبی ئیمام ئەحمەدو ئیمام مالیکە، هەروەها لە مەزهەبی ئیمام شافعیش دیسان کێشە لە سەر کافرکردنییان هەیە.

**دووەم: (مورجیئە).**

یەکێکەلە تاقمە کەلامەییەکان، کە خاوەن تێگەیشتن و بیرو بۆچوونێکی هەڵەن لە بواری ئیمانەوە، کە لە نێو خۆیاندا زۆر چوونیەك نین، کە هەڵبەت قسەیان سەبارەت بە زۆر تاقم ولایەن کردووە، یەکەم کەسیش کە قسەی ئیرجائی لێ دەرکەوت(ذر بن عبد الله المذحجي)یە، توندترینییان ئەوانەن کە ئەڵێن: ئیمان تەنها ناسینە و کوفریش بریتییە لە جەهل بەخوا، کە لەقسەکانییان ئەوە وەر ئەگیرێت کەوا ئیبلیس و فیرعەون تێراو تێر بڕوادارن؟،وە پێیان وایە کەوا ئیمان بەس بریتییە لە بەڕاست دانان و کردەوەش ناچێتە جوغزی ئیمانەوە، پێیان وایە کەسێك مادام لە دڵەوە بڕوادارە، ئەوە ئەگەر کردەوەشی نەبن، هەر بڕوادارەو ئەهلی بەهەشتە؟!

لە ڕووی زمانەوانیشەوە،"ئیرجاء " واتە: دوا خستن، هەروەك خوی گەورە دەفەرموێ: **[قَالُواْ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ]**[1] واتە: مۆڵەتی بدەو دوای بخە، هەروەها بۆئەوەش بەکاردێت کە ئومێدی پێ بدات، بە پێی ئەو مانایە مورجیئە دێن کردووە لە ئیمان جیا دەکەنەوە، واتە: تاخیری ئەکەن، یان لەبەر ئەوەی کە سزاکان لە تاوانباران دوا ئەخەن!. وە پێیان وایە کەوا تاوان هیچ کارێك ناکاتە سەر ئیمان، هەروەك تاعەتیش لەگەڵ کوفردا ڕێك ناکەوێت.

بە ناوبانگترین قسەکانی مورجیئەش ئەمانەی خوارەوەن:

-ئیمان تەنها بریتییە لە بەڕاستدانان و ناسین لە دڵ، کە ئەمە قسەی جەهمییەکانیشە ئەگەر لەگەڵی ڕێك بکەون.

---

([1]) - [الأعراف/١١١]

- ئیمان بریتییە لە گوفتاری زمان، ئەگەر ڕووتیش بێت لە ڕووی بیرو باوەڕەوە، واتە: مادام لە زمانەوە ئەڵێن: ئیماندارین ئەگەر لە دڵیشدا ئیمانی نەبێت، هەر بڕوادارە، کە ئەمەش قسەی کەرامی یەکانە.

- ئیمان گوفتاری زمان و بەڕاستدانانی دڵە بەس، ئەمەش قسەی فوقەهای مورجئیەکانە، کەواتە کردەوەکانی جەواریح بەدەرن لەم پێناسەوە، وە وا ئەزانن کەوا ئیمان جێگیرەو نە زیاد ئەکات و نە کەمیش ئەبێت!، کە ئەمەش پێچەوانەی بیرو باوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعەیە.

**سێیەم: (جەهمییە).**

جەهمییەکان ئەوانەن کە شوێن جەهمی کوڕی سەفوان کەوتوون، کەپێیان وایە بوونی خوا شتێکی موتڵەقە،بەڵام ئەو سیفەتانەی کە خوا هەیەتی لێی دا ئەڕنن، بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێت:دەستم هەیە، ئەوان دەڵێن نەخێر نییەتی، خوای گەورە دەفەرمووێت:إستواء دەکەم لەسەر عەرش ئەوان ئە لێن نەخێر إستواء ناکات،ئەویش گوایە بەوشێوەیە بەرگری لەخوای گەورە ئەکەن دەڵێن: نابێ وەك دروستکراوەکانی دەست و قاچی هەبێ و إستواء بکات، وە هەڵوێستیان وایە کە قورئان مەخلوقەو کەلامی خوا نییە، وە خوای گەورە بە سیفەتی قسەکردن قسە ناکات بەڵکوو بەس دەنگە ئەدرێ بە گوێدا!، وەهەروەها دەڵێن: هەموو کردەوەکانی بەندە خوای گەورە پێیان ئەکات و هیچ ئیختیارێکی بەندەکانی تیا نییە!،وە لەبارەی ئیمانیش ئەڵێن:ئیمان بەس بریتییە لە تەسدیق بە زمان، ئەگەر بەزمان بڵێن ئیماندارم ئەگەر شایەتیش نەهێنێ ئەوە مسوڵمانە.

**چوارەم: (موعتەزیلە).**

ئەمانیش کۆمەڵێکن سەرچاوەکەیان دەگەڕێنەوە لای (وائیل بن عطاء الغزال)، بەوە ناسراون کە ئەقڵیان پێش نەقڵ دەخەن، هەروەها قەدەری و وەعیدی و عەدلیشیان پێ ئە ڵێن، بۆیەش پێیان ئە ڵێن موعتەزیلە،چونکە دامەزرێنەری ئەم فیکرەیە دوای ناکۆکی لە بارەی حوکمی فاسقەوە، خۆی لە کۆڕی شێخ حەسەنی بەسرِی بە دوور ئەگرێت، ئەویش دوای ئەوەی کە پێشەوا حەسەنی بەسرِی"بەڕەحمەت بێت "ئەم و (عمرو بن عبيد) ی لە مەجلیسی خۆی دەرکردبوو، چونکە ئەیان وت: فاسق نە بڕوادارەو نە بێ باوەڕ، بۆیە لەو ڕۆژە وە ئەمان و ئەوانەی کە لەسەر ئەو فیکرەیەن پێیان ئەوترێت: موعتەزیلە.

**پێنجەم: (موشەبیهە)**

ئەوانەن کە سیفەتەکانی خوا دەشوبهێنن بە سیفەتی بەندەکان، وەك: پێکەنین و تووڕەبوون و دابەزین العياذ بالله.. هتد

**شەشەم: (موجەسەمە).**

ئەوانەن کە ئەندامەکانی خوا بە هی بەندەکان دەچوێنن، وەك دەست و قاچ و شێوە..هتد

**حەوتەم: (سۆفیگەری).**

ئەمانیش کۆمەڵێکن، کە داوای زوهدو بەندایەتی و خەڵوەو پشتکردن لە دونیاو لە خواردن و خۆنەشۆردن و لەبەرکردنی جلی زبرو.. هتد دەکەن، گوایە بەو شتانە دڵەکان ساف ئەبنەوە، هەندێکی تر دەڵێن: لەوە هاتووە کە جلی سووف لەبەر ئەکەن، هەندێکیش ئەڵێن نا لەوە هاتووە کە دەیانەوێ دڵی

خۆیان ساف بکەنەوە لە خۆش ویستنی دونیاو ئافرەت و پێکەنین و حەزوئارەزوو... هتد

دیارە بیدعەو خورافیاتیان گەلێك زۆرە تا ئاساتی شیرك و کوفریش پەنا بەخوا، وەك(ابن عربي الصوفي) یان کە لە (دمشق) لەخاك نراوە دەڵێ: **(الرَّبُّ عَبْدٌ، والْعَبْدُ رَبٌّ، يَالَيْتَ شِعْرِي مَنِ الْمُكَلَّفُ؟)**.واتە: پەروەردگار بەندەیە، بەندەش پەروەردگارە، ئایا لەو کاتە کێ تەکلیف بارە؟(نعوذ بالله).

یان سۆفییەکی تریان دەڵێ: **(وَمَا الْكَلْبُ والخِنْزِيرُ اِلاَّ إلهنَا، ومَا اللهُ إلاَّ رَاهِبٌ فِي كَنِيسَةِ)**.

واتە:سەگ و بەراز خوای ئێمەن، بەڵام هەرچی خوایە وا لە ناو کڵێسا گۆشەگیر بووە (نعوذ بالله).

وە هەندێکیان بانگەشەی غەیب زانی ئەکەن و پێیان وایە کەوا پیاو چاکانیش لەغەیب دەزانن و نزاو پاڕانەوەو هاوارکردنە گۆڕی پیاوچاکان بەشتێکی ئاسایی دادەنێن،پەنادەگرین بەخوای گەورەو بەدەسەڵات و بێ هاوتا.

**هەشتەم: (جەبری).**

ئەوانەن کە پێیان وایە بەندەکان لای خوای گەورەوە زۆریان لێکراوە کە گوناهو تاوان ئەنجام بدەن،بۆیە بڕوایان وایە کە بەندە بەهیچ گوناهێك تاوان بار نابێت،خواپەنامان بدات، کەئەمە ئەویەڕی درۆو بوهتانە بۆ خوای گەورە.

**نۆیەم: (قەدەری).**

قەدەری ئەوانەن کە ئینکاری ئەوە ئەکەن کە خوا لە قەدەرەوە علیمی بەشتەکان هەبووبێت، وە یەکەم کەسیش کە ئەم ڕایەی داهێنا کەسێبوو بە ناوی (معبد الجهني) پاشان (غيلان القدري) هاتن ئینکاری ئەوەیان کرد

که خوا عیلمی بەشتەکان هەبووبێت، ئەو کاتە کە عیلمی پێیان ئەبێ کە شتەکان ڕوودەدەن.. حوکمیشیان وەك ئیمام شافعی دەفەرمووێت: ئەگەر ئینکارییان لە عیلمی خوا کرد ئەوەپێی کافر ئەبن.

**دەیەم: (ئەشعەری).**

کۆمەڵێکن سەرەتایان ئەگەڕێتەوە سەر پێشەوا(أبي الحسن الأشعري) بە (ڕەحمەت بێت)، کە هەمان شێوازی ئەهلی کەلامی هەبوو سەبارەت بە بیروباوڕو وەلامدانەوەی دژەکانی، دامەزرێنەری ئەم بۆچونە (أبو الحسن على بن إسماعيل الأشعري)یە کە لە بەسرە لە ساڵی(٢٦٠)ی کۆچی لە دایك بووە و لە بەغدا لە ساڵی(٣٢٤)ی کۆچی وەفاتی کردووە، ئیبنو عەساکر بە(ڕەحمەت بێت)، دەڵێت: ئەبو حەسەنی ئەشعەری، پانزە ڕۆژ خۆی لە خەڵکی شاردەوەو لە ماڵەوە خەریکی موتالاو لێکۆڵینەوە بووە، پاشان کە دەرچووە، چۆتە مزگەوت و عەباکەی خۆی لەبەردا دا ئەکەنی و ڕای ئەگەیەنێت کە ئەو بیرو باوەڕەی کە پێشتر هەیبووە وەك عەباکەی کە دایکەند، لەخۆی داماڵیوەو پەشیمان دەبێتەوە، لەپاش ئەمە هەڵسا بەسەر لە نوێ نووسینەوەی بیرو باوەڕی ڕاست و درووستی، جا ئەشعەرییەکان ئەوانەن کە لەسەر ڕا کۆنەکەی شێخ حەسەنی ئەشعەری مانەوە، کە ئەو خۆی لێ بەری کردوون.

**یانزەیەم: (ماتۆریدی).**

قوتابخانەیەکی فیکرییە، کە شوێن کەوتەی ئەبوومەنسوڕی ماتۆریدین، وە یەکێ لە فیرقە کەلامییەکانن، وە زۆریش لە فیکری ئەشعەرییەکان دوور نین، تەنها لە چەند شتێکی سادە نەبێت، کتێب و نووسراویان زۆرە یەکێ لەوانە عەقیدەی طەحاوییە، کە ئیمام طەحاوی حەنەفی نووسیویەتی.

**دوانزەیەم: (ئەهلی کەلام).**

کۆمەڵێکی فەلسەفین و دەڵێن: ئیمان بریتییە لە بەڕاست زانین بە زمان و بەبێ بەڕاست زانینی دڵ و کردەوەکان، وە ئەقڵی خۆیان ئەخەنە سەرو نەقڵەوە، واتە:کۆمەڵێکی عەقڵانین و عەقڵ پیرۆز دەکەن، ئەگەر ئایەتێك یان فەرموودەیەکی ڕاست نەچێتە عەقڵیان وەری ناگرن و ڕەتی دەکەنەوە، یەکێ لەسەرکردە هەرە بەرچاوەکانیشیان کەزۆر کاریگەری هەیە لەسەریان کەسێکە بە ناوی باقلانی.

بێ لەویش زۆر کاریگەرن بە فیکری ئەرستۆ و ئەفلاتوون.. کاتی خۆیشی موحەمەد عەبدەو جەمالەدینی ئەفغانی پەیڕەوی ئەم جۆرە بیروبۆچوونەیان دەکردو ئێستاش کۆمەڵێکی زۆر کۆلکە خوێندەوارو نوسەری بێ دین و مولحید خۆیان بەم قوتابخانەدا هەڵواسیوەو لێرەوە لەدین دەدەن.

**سیانزەیەم: (ئەهلی سوننەو جەماعەت).**

ئەهلی سوننەت و جەماعەت: ئەوانەن کە پێك هاتوون لە کۆمەڵی ڕزگار بوو و کۆمەڵ و لایەنی سەرکەوتوو تا ڕۆژی دوایی،چونکە سەرەتایان پێشینەی ئەم ئوممەتە بوون کە سەقامگیر بوون لە سەر شوێن پێهەڵگرتن – الاتباع - و دروکەوتنەوەو وەلانانی داهێنان – الابتداع - لە بنەماو بەشەکانی دیندا،

وە زاراوەی (ئەهلی سوننەت)یش لە سەدەی دووەمدا دەرکەوت، کاتێ خەڵکانی هەواو ئارەزوو بازو کۆمەڵەکان زۆر بوون، جا ئیتر بەو ناوە لە جێگە لە خۆیان پێی جیا کرانەوە.

**چواردەیەم: (کۆمەڵی سەرکەوتوو (الطائفة المنصورة) کێن و سیفاتیان چییە)؟**

کۆمەڵی سەرکەوتو- الطائفة المنصورة – پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾پێناسەی کردوون هەروەك چۆن لەو فەرموودەی باسی کۆمەڵەکان ئەکات، وە فەرموودەیەکی دەست بە دەست- متواتر- بە هۆی زۆری ئەو ڕێگایانەوەی لێی گێڕدراوەتەوە، هەنێکیان هەندێکیان بەهێز ئەکەن، پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ئەفەرموێت: **(افترقت اليهود على إحدى وسبعين فرقة، و افترقت النصارى على اثنتين وسبعين فرقة، وستفترق هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة، قيل: من هي يا رسول الله؟ قال: من كان على مثل ما أنا عليه وأصحابي .وفي بعض الروايات :هي الجماعة)**[1]

واتە:(جوولەکە بوون بە حەفتاویەك بەشەوە، وە گاورەکان بوون بە حەفتاودوو بەشەوە، وە ئەم ئوممەتە لە داهاتودا ئەبن بە حەفتاوسێ بەشەوە، هەموویان لە ئاگردان تەنها کۆمەڵێکیان نەبێت، وتیان: کێن ئەوانە؟، فەرمووی:ئەو کۆمەڵەی کە لە سەر وێنەی ئەوەن کە منو هاوەڵەکانمی لە سەرین، وە لەهەندێ ڕیواتی تردا دەفەرمووێت: کۆمەڵی موسڵمانان).

---

(1) - ( رواه أبو داود والترمذي و ابن ماجه والحاكم، وقال :صحيح على شرط مسلم).

هەروەها لە وەسفی ئەم کۆمەڵەدا لە فەرموودەی ڕاستو دروست هاتووە، کە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾هەواڵی داوە کە هەن و لە بوندان وەك لە فەرموودەکەی جابری کوڕی سەمورەو مەعاویەو ئەبی هورەیرەوەو جگە لەوانیشدا هاتووە، کە لە پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ئەفەرموێت: **(یقاتلون على أمر الله)**[1] واتە: (لە سەر فەرمانی خوا ئەجەنگن). وە فەرمووی: **(قائمین على أمر الله)**[2] عن معاویة بن أبي سفیان. واتە:(لە سەر فەرمانی خوا بەرداوام ڕاوەستاون)، کەواتە ڕاستیو حەقیقەتی کۆمەڵی سەرکەوتوو ئەوەیە کە لە سەرئەوەن کە پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ لەسەری بووە، وە ئەوان پابەندودەستگرتون بە فەرموودەکانیەوە.

بەڵام کێن؟ ئەوە ئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێبێ) ئەفەرموێت: ئەگەر ئەهلی حەدیس وفەرموودە نەبن ئیتر نازانم کێن. مانای: ئەوانەی کە دەستگرتوو بوون بە سوننەتی پێغەمبەرەوە﴿ﷺ﴾کاتێك کە ئوممەت پەرتەوازە بوو بۆ خەوارج و موعتەزیلەو باتنیەکان و بوون بە چەند بەشێکەوە، ئەوجا ئەهلی ئەسەرو ئەهلی فەرموودەو ئەهلی سوننە مانەوە، کە هەموویان لە ژێر ناوی ئەهلی سوننەت و جەماعەت پێناسە دەکرێن و لە سەر پەیرەوی پێغەمبەرو هاوەڵە بەڕێزەکانی بەردەوام بوون، وە مەبەست لە ئەهلی حەدیس وفەرموودەش هەر ئەوە نیە کە یەکێك خەریکی زانیاری فەرموو دەبێت وبەس، بەڵکو ئەوەی شوێن کەوتەی سوننەت و ڕەوشتی پێغەمبەری خوایە﴿ﷺ﴾.

---

([1])(رواه مسلم (1920) عن ثوبان، ورو اية لا تزال عصابة رقم (1924) عن عقبة بن عامر، ومن حديث جابر (1923)

([2]) - رواه البخاري (71، 2948)، ومسلم (1037)

چونکە هەموو تاقمو کۆمەڵەکان بانگەشەی ئەوە ئەکەن کە شوێن کەوتەی قورئانن، بەڵام تەنها ئەهلی سوننەت لە ناو هەموو کۆمەڵە داهێنراوەکانی تر جیاکراوەنەتەوەو دەستیان بە سوونەتی پێغەمبەرەوە﴿ﷺ﴾گرتووە و پابەندی فەرموودەکانی پێغەمبەرن﴿ﷺ﴾.

کەواتە ئەوە ڕەوشت و سیفاتیانە، سەبارەت بە جێگەو شوێنی کۆمەڵی سەرکەوتووش شوێنێکی دیاریکراویان نییە، بەڵام وەك شێخی ئیسلام (ڕەحمەتی خوای لێبێت) باسی کردووە، ئەو فەرموودانەی لەم بارەوە هەن بەڵگەن لە سەر ئەوی کە لە کاتی دنیا کۆتایی بوندا کۆبونەوەی ئەم کۆمەڵە لە وڵاتی شام دەبێت، وە لە فەرمودەی ڕاستی پێغەمبەردا﴿ﷺ﴾هاتووە کە ئەفەرموێت: **(إِنَّ الإِيْمَانَ لَيَأْرِزُ إلى المدينَةِ كمَا تَأْرِزُ الحَيَّةُ إلى جُحْرِها)**[1]
واتە:(باوەڕ ئەگەڕێتەوە بو مەدینە یان لە نێوان هەردوو مزگەوتا- مزگەوتی حەرامو مزگەوتی مەدینە- هەروەك چۆن مار ئەگەڕێتەوە بۆ ناو کونەکەی خۆی).ئەم فەرموودەیە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو دوو شوێنە هەردووکیان دەبنە شوێنی جێگیربوونی ئیمان و باوەڕو تارۆژی دوایی.

بەڵام وڵاتی شام شوێنی شەڕو پێکدادان ئەبێت لە گەڵ بێ باوەڕاندا، وە هیچ پێچەوانەیەك لە نێوان ئەم دوو کارەدا نییە، چونکە ئەم ئوممەتە یەك ئوممەت و یەك لاشەیە، وە وڵاتی ئیسلام هەر یەکێکە، وە ئەم سنوورانەی کە هەیە هەمووی دەبێت لابرێتو نەمێنێت، وە خاڵی سەرەکیو بنچنەیی لە موسڵماناندا ئەوەیە کە هەموو یەك بەرەنو یەك نەتەوەن،

---

(1) - (البخاري (1777)، مسلم (147)، ابن ماجه (3111)، أحمد (286/2، 422)، عن أبي هريرة. وروا ية "بين المسجدين" عند مسلم (146) عن ابن عمر.

جا وڵاتی شام ئەو کاتە ئەبێتە شوێنی پێکدادانو دەستەویەخە لە گەڵ کافراندا، بەڵام شوێنی مانەوەی باوەڕو پتەوبوونی ئەوە بریتی دەبێت لە وڵاتی هەردووحەرەم بە تایبەت نێوان مەککەو مەدینە، وە بە تایبەتی تر لە نێوان خێڵی تەمیم وەك پێغەمبەر﴿ﷺ﴾هەواڵی داوەو دەفەرموێت: **(هم أشد أمتي على الدجال).**[1] واتە: (لەکاتی ئاژاوەی دەجالدا ئەوان – واتە خێڵی تەمیم – بە هێزترین کەس ئەبن لە سەر دەجالو لە ناوبردنی).

ئەگەر فەرموودەکان هەموو بخەینە پاڵ یەكو سەیریان بکەین ئەبینین کە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾باسی کردووە کاتێك کە ڕۆژی دوایی دێت، ڕۆم – واتە نەسرانیەکان- زۆرترینی خەڵك ئەبن، وە داستانێك لە گەڵ ڕۆمەکاندا دروست ئەبێت، وە هاتنی دەجال دوای ئەو داستانە ئەبێت، وە ئەو کاتە ئەم ئوممەتە زۆر پێویستە بۆ شەڕکردنیان ، وە شەڕەکە ئەکەوێتە وڵاتی شام ئەعماق و دابق وە لەو کاتەشدا جوولەکە لەو ناوچانە کۆ دەبنەوەو موسڵمانان شەڕیان لە گەڵ دەکەن، خوای گەورەش زاناترە.

**پانزەیەم: (سەلەفی) بەکێ دەوترێت شوێن کەوتەی(سەلەفی ساڵح)؟**

**سەلەفی:** واتە کەسێکە پەیڕەی بەرنامەی پێشینانی باشمان(السلف الصالح) دەکات.

**سەلەف:** واتە شتێک ڕابورێ و تێپەڕی بێت، بە کوردی پێشین دەگەیەنێت، واتە ئەوانەی پێش ئێمە و سەردەمی زێڕێنی ئیسلام کە بریتییە لە سێ سەدەی یەکەمی ئیسلام، پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾دەفەرموێت:

---

(1) - (البخاري (2405)، مسلم (2525) عن أبي هريرة).

**(خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثَلاَثًا ثُمَّ يَجِيءُ قَوْمٌ مِنْ بَعْدِهِمْ يَتَسَمَّنُونَ وَيُحِبُّونَ السِّمَنَ يُعْطُونَ الشَّهَادَةَ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلُوهَا)**[1] واتە: باشترین سەدە و سەردەمێک سەردەمی منە، پاشان ئەوانەی دوای ئێمە دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوانیش دێن، پاشان لەدوای ئەمانە خەڵكانێک پەیدا دەبن قەڵەو دەبن و حەزیان بە قەڵەوییە(واتە حەزیان لە خواردنە و گرنگی زۆری پێ دەدەن)، شایەتی دەدەن پێش ئەوەی لێشیان داوابکرێت(ئەوەش زەمە بۆیان).

باشی و قەبووڵی ئەوانە(پێشێنانمان) لەبەر ئەوەبووە کە دەقیان گرتووە بە ڕێگای ڕاست و دروستی ئیسلامەوە، کە ئەویش خۆی لە قورئان و سوننەتدا دەبینێتەوە، ئەوەیە بەرنامەی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی، هەروەکو خۆی لە فەرموودەیەکی باسی ئەوە دەکات کە ئەم ئوممەتە دەبێتە حەفتا و سێ بەش هەمووی بۆ ئاگرن تەنها یەکێکیان نەبێت، ئەوانیش دەبێت لەسەر ڕێگەی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی بن، شایەنی باسە ئەم کۆمەڵانە لەسەر بناغەی لادان و گۆڕین و پووچکردنەوە ئەسڵێکی ئەم دینە لە کۆمەڵی حەق جیادەبنەوە، یان عەقیدەیان شێواو و گومڕایی تێکەڵاو بووە یان حەڵاڵ و حەرامیان دەستکاری کردووە بەبێ بەڵگە، هەرچوار ئیمامەکانیش(مالیک و ئەبووحەنیفە و شافیعی و ئەحمەد) هەموویان هەر لەسەر ڕێگای سەلەف بوون (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت)، هەموو کەسیش بە ڕادەی دەرچوونی لە قورئان و سوننەت

---

(1) - (أخرجه السيوطي و صححه الألباني).

کەم و کورتی دەبێت و کەسیش بێ هەڵە نییە مەگەر پێغەمبەرمان ﴿ﷺ﴾ کە بێ هەڵەوتاوانە.
ئەگەر بەکەسێکیش بوترێت سەلەفی لەبەرئەوەی بە چەوتی و بیدعە و دەرچوونەکانی موسوڵمانی نەشارەزا و کۆمەڵە گومڕاکان ڕازی نییە، ئەوە جائیزە و سوپاس کراوە، هەموو دەبێت هەروا بین، توند بین لەسەر دەرنەچوونی خەڵکی و موسوڵمانان لە بەرنامەی ساغی دینەکەمان کە قورئان و سوننەتە، وە شەرتیش نییە هەرکاس ناوی لەخۆی نا سەلەفی لەسەر ئەو ڕێگە ڕاستە بێت کە پێشینانی ئومەتی لەسەربووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە تێکەڵەیەك هەیەو و ڕاست و چەوتیشیان هەر بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرمان ﴿ﷺ﴾ دەناسرێنەوە، بۆیە دەبێت تاکی مسوڵمان خۆی شارەزابکات لەبیروباوەڕی ڕاست و دروستی ئیسلام تاوەکو لەسەر ڕێگای ڕاست بمێنێتەوەو بەدووربێت لەسەرجەم ئەو تاقم و کۆمەڵانەی کەلایان داوە پشتیوان بەخوای گەورە.
کەواتە ئەگەر بەم شێوەیە بوو ئەوا هەموومان دەبێت شوێنکەوتەی سەلەفی سالح بین، بەڵام دەبێت تێبینی ئەوەش بکەین کە سەلەفێتی تەنها ناوێک نییە و هەرکەسێک وتی ئیتر بەهەشت بۆ خۆی بەرێتەوە! بەڵکو سەلەفێتی بەرنامەیە و ناوەڕۆکە، ئەوەی پەیڕەوی دەکات بەڕاستی شوێنی ڕێگای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و هاوەڵاکانی کەوتووە.
کەوابوو: سەلەف واتا ڕابردوو ، سەلەفی واتا شوێنکەوتەی پیاوچاکانی ڕابردوو بەڵام وا دیارە شێخ فەوزان ئەو ناولەخۆنانەی پێ پەسەند نییە، دەفەرمووێت:

"خوا دەزانێت کێ شوێنکەوتەی سەلەفە بۆیە پێویست ناکات بڵێیت سەلەفیم" ، وە زانایانی تر هەن دەفەرموون دروستە و دەکرێت.

**شانزەیەم: (وەهابی):**

هەر سەلەفییەت دەگرێتەوە، مەبەستیش لەو ناوە (موحەمەدی کوڕی عەبدول وەهاب) -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- لەگەڵ هەموو ئەوانەی بۆچونیان وەکو ئەو وایە، بەڵام ناوی وەهابی، خوازیاری خۆی نەبووە، بەڵکو قوتابی و هاوڕێکانیشی ئەوناوەیان دانەناوە،وە هەروەها کەسانێکیش کە خۆیان بە شوێنکەوتووی قورئان و سوننەت بزانن، بەڵکوو ئەم نازناوە لەلایەن دوژمنانی ئیسلام و کوفرەوە نووسێنراوە پێیانەوە، ئەگینا جائیز نییە بۆ موسوڵمانێکی ڕاستگۆ بڵێت من وەهابیم!

موحەمەدی کوری عەبدولوەهاب-ڕەحمەتی خوای لێ بێت- لەساڵی(١١١٥)ی کۆچی لەدایک بووە، لە سەردەمی خۆیدا بە تازەکەرەوەی دین دادەنرێ و توانیوێتی خەڵکێکی زۆر بگێڕێتەوە سەر بەرنامەی قورئان و سوننەت و لە بیدعە و لادانەکان ڕزگاریان بکات.

**تێبینی:** دیارە باس کردنی ئەم کۆمەڵانە تەنها بە کورتی یەك باسیان لێوە کراوەو تاقم و کۆمەڵی تریش هەن کەئاماژەیان پێ بکرێت بەڵام بەپێویست نەزانرا باسیان بکەین، چونکە زۆرینەیان هەر لەم بیرو بۆچونانەوە سەرچاوەیان گرتوەو بەشێوەیەکی نوێگەری دێنەوە مەیدان ، وە ئەمەشی کەلێرەدا ئاماژەمان پێکردوون بۆ ئەوەیە لانی کەم تاکی مسوڵمان ئاگاداری ئەو بیرو بۆچونانە بێت کە لە نێو کۆمەڵگای ئیسلامی دا بڵاو بونەتەوە،تابزانێت کام ڕێگا بگرێتە بەر تاوەکو لە دونیاو دوارۆژیش دا سەرفراز بێت،

چونکە لە پاش وەفاتی پێغەمبەری خواوە﴿ﷺ﴾تاوەکو ئێستا دەیان کۆمەڵ بیروبۆچون و تاقمی گومڕا دروست بوون و، بەردەوامیش هی تازە دروست دەبن کە بە هەزارەها وتارو نوسین و کتێبی چاپ کراویشییان بڵاو کراونەتەوە و کەسانێکی زۆریش لە مسوڵمانان بێ ئاگا یان بە ئاگا یان دەیان دەستی ناحەز بە ئیسلام ڕەواج بە کتێب و نامیلکەی ئەو تاقمە گومڕایانە دەدەن وە هەموو پاڵپشتێکی مادی و مەعنەوی یان بۆ دەکرێت وە کردوویانن بە مەنهەج بۆ پەروەردەکردنی تاکی مسوڵمان ئەوەش بزانە کەوا چارەسەر تەنها گەڕانەوەمانە بۆ ئەسڵی قورئان و سوننە ت کە دەتوانین بە هەوڵ و کۆششی سەر ڕاستانە بۆ خوای گەورە بە نی یەتێکی پاکەوە و بەپشتیوانی خوای گەورە و لەسەر شاڕێی شوێنکەوتنی ڕاستەقینەی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ئەویش تەنها بە فێربوون و شارەزایی و گەڕان بەدوای زانستی شەرعی دا دەگەینەوە بە پێغەمبەری خواو﴿ﷺ﴾هاوەڵانی بەڕێزی(خوایان لێ رازیبێت) وە پیاو چاکان و زانایانی پێشین(ڕەحمەتی خوایان لێبێت).

## لەکۆتاییدا

داواکارین لەخوای گەورە ڕێنموی زیاترمان بکات بۆ سەر ڕێگا ڕاستەکەی و بەدوورمان بگرێت و پەنامان بدات لە ڕێگاو وەسوەسەی شەیتان و کۆمەڵە لادەرەو گومڕاکان و، بەشوێنکەوتەیەکی چاکی ئەهلی سونە ت و جەماعەت و کۆمەڵی سەرکەوتوو حسابمان بۆ بکات بەتێگەشتنی پێشینە چاکەکان و ئەم نوسینەش بخاتەسەر توێشوی چاکەکانمان و لەسەرجەم هەڵەو کەم و کورتیەکانمان خۆش بوبێت و پاداشتی خێری سەرجەم ئەو زاناو بانگخوازو مامۆستا بەڕێزانەش بداتەوە کە لەوتارو نوسین و بڵاوکراوەکانیان سوود مەندبووم ،لەگەڵ کۆمەڵێك ماڵپەڕی ئیسلامی کوردی و عەرەبی،خوای گەورە بیکاتە توێشوی دوواڕۆژی هەموو لایەکمان.

....... بەپشتیو انی خوای گەورە تەواو بوو .......

بەندەی خوا: رەنج شێخانی

## سەرچاوەکان


القُرْآنُ الْكَرِيمُ..........................................بِرِوَايَةِ حَفْصٍ عَنْ عَاصِمٍ الكُوفِيّ

بەرنامەی دەنگی قورئان.......................................... ماڵپەڕی دەنگی ئیسلام

تەفسیری ڕامان ............................... ............. ئەحمەد کاکە مەحموود

تەفسیری ئاسان. ..........................................................بورهان محمد امین

پوختەی تەفسیری قورئان .........................................................محمد ملا صالح

پوختەی پایەکانی باوەڕ ................................................... کاوان کوردی

شایەتومان......................................... سەعید حەوا،و:ئازاد نجم الدین

العقیدة في قرآن والسنة. .................................................. محمد جمیل زینۆ

العقیدة أهل السنة والجماعة. ............................محمد بن صالح العثیمین

نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ڕووداوەکانی پێش هاتنی...........هاوڕێ محمد امین

بەهەشت و دۆزەخ . ...............................................................باوکی محمد

دۆزەخ ............................................................... محمد ملا فائق شارەزووری

الولاء والبراء ..............................................................و،حەمزە بەرزنجی

العقیدة الصحیحة و نواقض الإسلام. ...............(إبن باز)و،حەمزە بەرزنجی

أرکان الاسلام والایمان من الکتاب والسنةمحمدجمیل زینۆ، و،حەمزەبەرزنجی

سیفەتی دووڕووەکان..................................................و،نەوا محمد سعید

پوختەی بیرو باوەڕو عەقیدە بەبەڵگەی قورئان و فەرموودە. طارق حسن هەمەوەندی

ئەوماڵپەڕانەی کە سوودم لە بابەتەکانیان بینیوە بریتین لە:

- موقع هولي القرآن.
- موقع جامع الحديث نبوي
- موقع جامع السنة وشروحها
- موقع الموسوعة الاحاديث
- موقع اسلام ويب
- موقع الإسلام والجواب
- موقع الطريق الاسلام
- موقع الإسلام والجواب
- ماڵپەڕی دەنگی ئیسلام
- ماڵپەڕی حەمزە بەرزنجی
- ماڵپەڕی ڕێگای ڕاستی

- ماڵپەری ڕێگای ئیسلام
- ماڵپەڕی ئیسلام هاوس

لەگەڵ کۆمەڵێك نوسراو بابەتی گرنگ و بەسوودی ، مامۆستا(هێمن عبدالعزیز) و هەندێك ماڵپەڕو نوسراوی تردا کە لێرەدا ناویانم لە بیر کردووەو لەیادم نەماون داواکارم لە خوای گەورە پاداشتی خێری هەموولایەکیان بداتەوە یارب العالمین.

هەموو کەسێك دەتوانێت ئەم پەرتوکە کۆپی بکات و بیبەخشێت لەڕێی خوادا وەهەموو ماڵپەڕێکی ئیسلامیش دەتوانن بڵاوی بکەنەوە إن شاء اللە.